سالّی حەوتەم

83

ئایاری ٢٠١٥

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی



ئازاری ڕێ!

ئەگاسا کریستی

هەناسەی ئاسوودەیی

پەشیمانم

چاوەڕێی یارمەتی مەبە، تۆ ببەخشە!

ئێمە کار دەکەین، کەواتە ئێمە هەین!

خاوەنی ئیمتیاز

ئەندازیار:

مەسعود تــاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگــەرد فـــارس

زاهـیـــر زانـــا

محەممەد مێرگەیی

محمد هاشم محمد

وەهـاب حەسـیب

یەحیـــا محەممەد

گوڵان حەمەئەمین

ڕاوێژکاری یاسایی

پارێزەر:- ئازاد محێدین

بەشی هونەری و دیزاین

پشتیوان عبدالرحمن

تایپ

کلسوم جەلال

No:

83

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-
نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر
٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

bryarmagazine

دابەشکردن:کۆمپانیای پەیك
07708649210
چاپ:کۆمپانیای پیرەمێرد

# هەمیشە هاوڕێی کتێب بن!



زۆر خۆشحاڵ بووم بە تاسەو پەرۆشیی خەڵك بۆ کتێب لە پێشانگای نێودەوڵەتیی کتێب لە شاری هەولێر؛ چونکە ئەوەی دڵخۆشی کردبووم، ئەوەبوو کە هەستم کرد بەو کارەیان ڕێگای ڕاستەقینەی بەختەوەریی خۆیان دۆزیوەتەوە!

ڕووکردنە کتێب، ڕووکردنە بەرەو دەروازەی کامەرانیو ئاسوودەیی.

لەم بارودۆخە دژوارو سەختو پڕ قەیرانەدا، پەنابردن بۆ کتێبو خوێندنەوە، باشترین ڕێگاچارەیە بۆ کەمکردنەوەی گوشارەکانو وەرگرتنی هەناسەیەکی پاك، بۆ ژیانو هەوڵدان بۆ چارەسەری کێشەکان.

ئەم ساڵ پێچەوانە بە هەموو پێشبینییەکان، ڕێژەی کتێب کڕینو ڕووکردنە کتێب، لە هەموو ساڵانی پێشوو باشتر بوو، وێڕای کێشەی نەبوونی مووچەو کۆمەڵێك قەیرانی دارایی!

ئەمەش ئاماژەیەکی باشە، کە تاکی کورد گەیشتووە بەوەی کە کێشەکانی ئێمە، تەنها ماددی نینو قەیرانەکانی ئێمەش، تەنها ئابووری نین!

ڕێگای بەختەوەریی ئێمە تەنها پارە دابینی ناکات!

پارە ناتوانێت بە تەنیا کێشەکانی ئێمە چارەسەر بکات!

دوورکەوتنەوە لە کتێب، لە ڕاستیدا دوورکەوتنەوەیە لە ژیانو مرۆڤو ئاسوودەییو ڕۆشنبیریو کەلتوورو هەموو جوانییەکان، گەورەترین قەیرانو کوشندەترین دەردی کۆمەڵگای ئێمەیە!

دواکەوتنی مووچە، هێندەی کێشەی ئابووریو تەسلیمکردن بەو ڤیستانەمان بۆ چارەسەر دەکات، کە زۆربەیان کەمالیاتی ژیانن، بەڵکو لەوانەیە ئاڵۆزتری بکات!

پرسیارگەلێکی زۆر هەن، کە تەنها ماددە بە تەنیا ناتوانێ وەڵامیان بداتەوە!

وەکو جۆن ماسلۆ دەڵێت: ئەگەر تۆ تەنها چەکوشت بەدەستەوە بێت، هەموو شتەکانت، وەکو بزمار دێتە پێش چاو!

هەر کەسێکیش تەنها ماددەی بەدەستەوە بێت، وا دەزانێت؛ هەموو کێشەکان، تەنها بە ماددە چارەسەر دەکرێن.

لێدوانو قسەکردنو گفتوگۆکانی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، زۆربەیان سەرقاڵی باسکردنی قەیرانی ئابوورین، بێئەوەی بزانین ئێمە بە ئابووری وڵاتەکەمان، چیمان ئەنجام داوەو چی دەکەینو بە تەمای چین؟!

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، باوەڕی تەواوەتیمان بەو وتە جوانەیە کە دەڵێت: *ئەگەر دەتەوێت، مرۆڤێك بەختەوەر بکەی، فێری خوێندنەوەی بکە!*

خۆشەویستانم: زۆر باشتان کرد، بۆ پشووی ڕۆحو ئاسوودەییو ڕێکخستنی ژیانتان، کتێبتان هەڵبژارد، ئەو پارەوپوولەی کە زۆر بەزەحمەت پێکەوەتان نابوو، داتان بە کتێب!

چونکە ئێوە دەزانن، کە خۆراکی مێشك، پێش خۆراکی گەدەیە!

ئاتاجی ئێوە بە زانستو ڕۆشنبیریو پەروەردەو گەشەپێدانو گرنگیدان بە ناخ، پێش ڕووکەشو شتومەکو جلو بەرگو پێویستییە ماددییەکانی دیکەیە!

*بردنەوەی مەڵۆیەك گۆڤارو کتێب بۆ نێو ماڵو خێزانەکەتان، گرنگترە لە بردنەوەی گەنجینەیەك ئاڵتوون!*

کتێبخانەیەکی بچووك لە ماڵەکەتاندا، جوانترە لە هەموو توحفەو شتە جوانەکانی دونیا، جوانترینو بەنرخترین خەڵاتی خوداوەندی باڵادەستو دەوڵەمەندو دارا، بۆ پێغەمبەرانی خۆشەویستی "کتێب" بوو..

خودا دەیتوانی ئاڵتوونو زیویان بەسەردا ببارێنێ، بەڵام ئەوەی کە بۆی ناردن بە هەموو زێڕو زیوی دونیا، سەودا ناکرێ!

هەموو دیارییەك بە نرخو بەهای ماددی، نرخی دیاری دەکرێ، تەنها کتێب نەبێ!

دووبارە دەستخۆشیتان لێدەکەم، کە کتێبتان هەڵبژارد؛ بۆئەوەی لەم زەمەنە دژوارەدا هاوڕێتان بێت، بێگومان باشترین هاوڕێتان هەڵبژاردووەو هەوڵدەن هەمیشە هاوڕێی بەردەوامی کتێب بن!

# کارگێڕی

# بە

# گوفتار

هاوڕێیەتیی چاکان، خێرو چاکەت بۆ دەکاتە میرات، هاوڕێیەتیی کەسانی خراپیش، پەشیمانی دەکاتە میراتت.

ئیبنولموقەففەع

سێ شت چارەیان نییە.. هەژاری؛ ئەگەر تێکەڵی تەممەڵی بوو، ناکۆکی؛ ئەگەر ئاوێتە بوو بە حەسوودی، نەخۆشی؛ ئەگەر تێکەڵ بوو بە پیری.

پەندێکی عەرەبی

یەکەم هەنگاوی زانست: بێدەنگییە، دووەم هەنگاو: گوێگرتنە، سێیەم: لەبەرکردنە، چوارەم: کارپێکردنە، پێنجەم: بڵاوکردنەوەیەتی.

ئەسمەعی

ئەوماڵەی میوان ناناسێت، گۆڕستانێکە بۆ ئەندامانی خێزانەکەی..

میخائیل نەعیمە

ڕێگا گوڵڕێژکراوەکان، نامانگەیەننە لووتکەی سەرکەوتن.

لافۆنتین



# چاوەڕێی یارمەتی مەبە،
# تۆ ببەخشە!

(پاول) لە براکەیەوە، ئۆتۆمبیلێکی بە دیاری بۆ هاتبوو، ئەو کاتەی کە تازە سویچی ئۆتۆمبیلەکەی وەرگرتبوو، دەیەویست تاقی بکاتەوەو بۆ یەکەمجار لێی بخوڕێ، مێردمنداڵێك بە دەوری ئۆتۆمبیلەکەیدا دەهاتو بە سەرسوڕمانەوە تەماشای دەکردو پاشان پرسی: ئەم ئۆتۆمبیلە هی خۆتە؟

(پاول) لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ، ئەمە دیاری براکەمە بۆ من!

دوبارە مێردمنداڵەکە بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە گوتی: وای چەند ئاواتەخوازم کە منیش....

پێش ئەوەی قسەکەی تەواو بکات (پاول) گومانی وابوو، کە مێردمنداڵەکە خۆزگە بەوە دەخوازێت، کە ئەویش برایەکی وای هەباو وەکو ئەم ئۆتۆمبێلێکی خەڵات کردبا!!

بەڵام کاتێك قسەکانی تەواوکرد، گوتی:

خۆزگە بەوە دەخوازم، کە منیش وەك براکەت بتوانم ببەخشم‌و توانای ئەوەم هەبێت، ئۆتۆمبێلێکی وەها ببەخشمە براکەم!

**لەم چیرۆکەوە فێردەبین:**

١- نابێت ئێمە هەمیشە هەر چاومان لەوە بێت؛ کەسانی دی یارمەتیمان بدەن، با ئێمەش دەستپێشخەربین‌و ئێمە سەرەتا ببەخشین.

٢- خۆزگەخواستن بەوەی برایەکی باشمان هەبێت، تا پێمان ببەخشێت، زۆر ئاسانە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە، کە خۆزگە بخوازین ئێمە ئەو برا باشە بین.

٣- وەکو پەیامبەر "درووودو سڵاوی خودای لێبێت" دەفەرموێ: دەستی بڵند، لە دەستی نەوی بەڕێزترە. واتە: ئەو دەستەی دەبەخشێ، گەورەترە لەو دەستەی کە وەردەگرێ.

٤- بەخشندەیی، سیفەتێکە؛ هەموو کەس خۆشی دەوێ، تەنانەت دوژمنەکانیشت، ڕژدی‌و بەخیلیش، سیفەتێکە؛ هەموو کەس ڕقی لێیەتی، تەنانەت دۆستەکانیشت.

٥- هەر کاتێك لەبری ئەوەی چاومان لە دەستی کەسانی دی بێت، خۆمان بیرمان لە بەخشین‌و دەستگیرۆیی کەسانی دی کردەوە، ئەوا زۆر ئاسوودەو کامەران دەبین‌و لە زۆر کێشەی خەمۆکی‌و دڵتەنگی، ڕزگارمان دەبێت.

# تەنها بۆ سەرکردەکان

**پەندێکی ڕووسی**

لە ناواخنی هەر یەکێکماندا، دادگایەکی دادپەروەر هەیە، کە هەمیشە حوکمەکانی بێدارن لە دەروونماندا، ئەویش ویژدانە!

**نەزانراوە**

نە هەڵۆ، مێش ڕاو دەکات، نە شێریش، مشك..

**جۆرج بەرناردشۆ**

مەینەتیی درۆزن لەوەدا نییە، کە کەسێك بڕوای پێناکات، بەڵکو مەینەتییەکەی لەوەدایە، کە هیچ کەس بڕوای پێناکات.

**بوزورگمەهر**

درۆزنو مردوو وەکو یەك وان؛ چونکە خۆشیی ژیان بریتییە لە قسەکردن، خۆ ئەگەر کەس بڕوا بە قسەی درۆزن نەکات، ئەوا ژیان، بێماناو مایەپووچە.

**پێشەوا غەزالی**

قسەی نەرمونیان، دڵەکان نەرم دەکات، با لە بەردیش ڕەقتر بێت، قسەی زبرو ڕەق، دڵەکان زبرو ڕەق دەکات، با لە ئاوریشمیش نەرمتر بن.

# نیشانەکانی کۆبوونەوەی سەرنەکەوتوو؟

کۆبوونـــەوەکان، ئامانجیـــان گفتوگۆکردنـــە لەســـەر بابەتەکانی کارکردنو گەیشتن بە بڕیارە دروستەکان، بەڵام هەندێجـــار، بگرە زیاد لـــە جارێکیش، گردبوونـــەوەکان بە سەرنەکەوتوو کاتکوژ ناودەبرێن. بۆچی؟

چونکـــە کۆبوونـــەوەکانو شـــێوازی کارکردنیان، شـــێوە سرووشـــتییەکەی گردبوونەوە لە دەست دەدەن، لە ئامانجە گشـــتییەکان دوور دەکەونـــەوەو بەلاڕێدا دەبرێـــن، گەلەك لاباس دەهێنرێتە ناوەوە، دەبن بە باسوخواســـی ســـەرەکیی گردبوونەوەکە.

یەکێـــك لە ســـیمای بەڕێوەبەرێتییـــە دواکەوتووەکان (بەڕێوەبەرێتییـــەکان لـــە هـــەر ئاســـتێکدابن ئاســـتی وەزارەتـــەکان، بەڕێوەبەرێتـــی فەرمانگەو دامـــەزراوەکانو ... هتـــد)، زۆری کۆبوونـــەوەکانو دەرکردنی بڕیاری زۆرو بێناوەرۆکە، کە تەنها لەســـەر کاغـــەز بوونیان هەیە، ئەو کارەش بـــۆ خـــۆی هێندەی دیکە، دیـــوە دزێوەکەی ڕۆتین پیشان دەداتو کاتو کۆششی دامەزراوەکەو کارمەندانی بە فیڕۆ دەدات.

**نیشانەکانی کۆبوونەوەی سەرنەکەوتوو:**

**یەکەم: بەر لە کۆبوونەوە:**

١. بانگهێشـــتکردنی ژمارەیەکـــی زۆری ئامادەبـــووان، بەشـــێوەیەك هەندێجار ژمارەیان دەگاتە سی، تا چل کەس، قوڕەکە خەســـتر دەبێتەوە، کاتێـــك ژووری کۆبوونەوەکە لە توانایـــدا نەبێت، ئەو ژمارەیە لـــە خۆبگرێت، واتە: جێگای کۆبوونەوەکـــە بۆ ئـــەو ژمـــارە زۆرەی ئامادەبـــووان ئامادە نەکرابێت.

٢. ئاشـــکرانەبوونی، یـــان ئاشـــکرانەکردنی ئامانجـــی گردبوونەوەکـــەو ئـــەو بابەتانـــەی گفتوگۆیـــان لـــە بارەوە دەکرێتو ئەو بڕیارانەی دەردەکرێن.

٣. خۆئامادەنەکردن بەشێوەیەکی تەواو بۆ کۆبوونەوەکە، ئەوەش بە خوێندنەوەی ڕاپۆرت، وەستان لەسەر ئەو بابەتانەی کـــە هۆکاری دەنگ بەرزکردنەوەن، باســـکردنو پیشـــاندانی کۆمەڵێك ڕاســـتی بۆ یەکەمجار، کە لە کۆبوونەوەکەدا باس

وەهاب حەسیب محەمەد



دەكرێنو دەدرێن بە گوێچكەی ئامادەبووواندا.

٤. ئامادەنەكردنـــی ئـــەو ئامرازانـــەی لـــە ژووری كۆبوونەوەكەدا، یارمەتیی سەركەوتنی گردبوونەوەكە دەدەن وەك: داتاشۆ، تەختەسپیو... هتد.

**دووەم: سەرەتای كۆبوونەوە:**

١. پەیوەســتنەبوون بـــە كاتـــی كۆبوونەوەكـــەوە، پـاش چارەكێك، یان نیوكاژێر لە وادەی گردبوونەوەكە، ئامادەبووان یەك بەدوای ئەویتردا خۆیان دەكەن بە هۆڵی كۆبوونەوەكەدا، لەوانەیە (ڕێكخەری كۆبوونەوەكە)ش درەنگ ئامادە بێت.

٢. ناڕوونـــی لـــە ئامانجـــی كۆبوونەوەكـــەدا، دەبینیـــت ئامادەبـــووان پرســـیار لـــە ئامانجی كۆبوونەوەكـــە دەكەنو وەڵامیان دەست ناكەوێت.

٣. بەرلـــەوەی گردبوونەوەكە لە بارەی ڕاســـتییەكانەوە وتوێژی تێدا بكرێت، بـــە ئاماژەیەكی بەڕێوەبەر گفتوگۆكە بە لاڕێدا دەبرێ.

٤. ئامادەنەبوونی ئەو كەســـانەی كە ڕۆڵی سەرەكییان لە كۆبوونەوەكەدا هەیە، هۆكاری ئامادەنەبوون، یان بانگهێشت نەكردنیان، گرنگی نەدانە بەو كەســـانە، یاخود ئەو كەســـە بنەڕەتییانـــە بە مەبەســـت ئامادە نابن، تـــا گردبوونەوەكە شكست بهێنێت.

**سێیەم: لە كاتی كۆبوونەوەكەدا:**

گفتوگۆو دەركردنی بڕیار:

أ. دەرچوون لە بابەتی گردبوونەوەكەو خەریكبوون بە بابەتی لاوەكییـــەوە، یان دەرچوون بەتەواوی لە بابەتە ســـەرەكییەكە، بەشێوەیەك وتوێژ لەو بارەوە ئازاربەخش دەبێت.

ب. ڕۆچوون بە ناو وردەكارییەكاندا، وەك گەڕانەوە بـــۆ حســـاباتو ژمـــارەكان (داهـــاتو خەرجـــی وەك نموونـــە)و لە كۆتاییـــدا نەتوانرێت، جەخت بكرێتەوە ســـەر ئامانجە ســـەرەكییەكان (زۆركردنی قازانج، یان خزمەتگوزارییەكیان وەك نموونە).

پ. هاننەدانـــی زمانـــی گفتوگـــۆو ئاخاوتـــنو ڕێزگرتنی بەرانبـــەر، دەبینیت یەكێك ســـەركۆنەی ئەوی دیكە دەكات، كەسێك شۆخی بەوی دیكە دێتو ... هتد.

ت. شـــۆخیو پێكەنینی زیاد لە پێویست (گاڵتەكردن) لە كاتی گردبوونەوەكەدا بە نوكتەی زۆرو ...هتد.

ج. ماوە نەدرێت ئامادەبووان بەشێوەیەكی گونجاوو ڕێك، ڕاستییەكان بخەنەڕوو، قسە پێبڕینو هێرشكردنە سەریان بە دەمڕێژی قسە.

چ. هێرش كردنە سەر ئەو كەسەی كە بابەتێك، یان زیاتر دەخاتـــە ڕوو، بەشـــێوەیەك بەرەنگاری دەبنـــەوە، نەتوانێت بەتەواوی ڕاڤەی بابەتەكەی بكات.

ح. دەســـتنەگرتن بەســـەر گردبوونەوەكـــەداو بەرەنگارنەبوونـــەوەی كەســـێك؛ گەرەكـــی بـــێ كۆبوونەوەكە شكست بهێنێت.

خ. هەڵســـانی هەندێك لە گوێگرانو دەستكردن بە ڕاڤەی بابەتە لاوەكییەكان.

د. كەســـێك دئاخڤێـــتو (بەڕێوەبەر بـــە نموونە) ئامادەبووان ســـەدەق بۆ قسەكانی دەكەن، بەشێوەیەك كۆبوونەوەكـــە كـــە لـــە ڕاســـتییدا دەبـــوو زانیـــاریو ڕاســـتییەكانی تێـــدا بخرێتـــە ڕوو، دەبێتـــە هۆكارێك بەڕێوەبەر ئامادەبووانی تێدا تەڵقین دەدات.

ر. گوتوبێـــژ لە بارەی قســـەی جـــوانو بابەتی گەورەوە، دواتر هیچیان جێبەجێناكرێن!

ز. زاڵبوونـــی بەرژەوەندیـــی تایبەت بەســـەر گوتوبێژی كۆبوونەوەكەدا.

ژ. درۆكردنو دووڕوویی.

**چوارەم: ئەو كارانەی لە كۆبوونەوەیەكی شكستخواردوودا پەیوەندییان بە بواری ڕێكخستنەوە هەیە:**

١. ڕێگەدان بە ئامادەبووان لە ژووری كۆبوونەوەدا مۆبایل بەكاربهێنـــن، ئەو كارەش ئەوپـــەڕی خراپەیە بەتایبەت لە كاتی ژمارەیەكی زۆری ئامادەبووواندا.

٢. جگەرەكێشان لە ناو ژووری كۆبوونەوەكاندا.

٣. ڕێگەدان بەوەی ئاستی وتووێژو ئاخاوتنەكە دابەزێت.

٤. چوونە ژوورەوەو هاتنەدەرەوە لە هۆڵی كۆبوونەوەكاندا.

٥. دوای دەســـتپێكی كۆبوونەوەكـــە، بـــە ماوەیەكی زۆر كەسانێك بۆ كۆبوونەوەكە بانگ بكرێن؟!

**پێنجەم: كۆتایی كۆبوونەوەكە:**

١. درێژكردنـــەوەی كاتەكان بۆ كاژێرێكو چەندین كاژێر بە هۆكاری ناڵۆژیكی.

٢. بێئـــەوەی بڕیارێكی ئاشـــكرا دەربكرێت كۆبوونەوەكە كۆتایی پێ دەهێنرێـــت، دەبینیت كۆتایی بە گردبوونەوەكە دەهێنرێت، كەسیش نازانێت بڕیار دەركراوە، یان نا؟!

دوایی كۆبوونەوەكە:

١. هەمووان (ئامادەبووان) وەڕسو بێتاقەتن.

٢. كارەكان باش نابن، كەس خۆی تێكنادات!

**شەشەم: كۆبوونەوەكانی دواتر:**

هەمان هەڵەكانی پێشوو.

**حەوتەم: بابەتە پەیوەندیدارەكان:**

١. بەڕێوەبردنی كۆبوونەوەكان.

٢. بانگهێشتی ئامادەبووان.



ن: د. عبدالکریم بکار
و: حسێن نەجمەدین قەرەداغی

بەشی سێیەم

# گەشەپێدانی تەواوکاری لە پێناو مرۆڤدۆستیدا

مرۆڤ، تەوەری سەرەکیی بوونەوەرە، هەر لەبەر ئەو هۆکارەیە، کە خودا پێغەمبەرانی بۆ ناردووە، پەڕاوی پیرۆزی بۆ دابەزاندووە، فریشتەکان سوجدەی ڕێزیان بۆ بردووە.

ئەمرۆ بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیاوە، زیاتر لە هەموو کاتەکانی ڕابوردوو پێویستمان بە قووڵکردنەوەو تێگەیشتن لە مرۆڤدۆستی هەیە؛ چونکە لە ڕابوردوودا مرۆڤ نەیدەتوانی لە ئانو ساتێکدا، کاری خراپو کۆمەڵکوژی وا ئەنجام بدات، بەو ڕادەیەی کە ئێستا بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاوە، دەتوانێت ئەنجامی بداتو بەئاسانی بە دانانی تەنها یەك پەنجەی دەستی، یان ڤاچی، یان داگیرساندنی پلاکێك، ئەوا بە هەزاران مرۆڤ لە ژیان بێبەش دەکات.

ئەگەر مرۆڤدۆستی، لە ناخو بیرو هۆشی تاکەکانی کۆمەڵدا نەڕوێنرێتو گەشەی پێ نەدرێت، ئەوا هیچ دوور نییە؛ ئەو مرۆڤە ببێتە دڕندەیەکی چەکبەدەست.

بۆ بنیاتنانو قووڵکردنەوەی هەستی مرۆڤدۆستی، لەسەر مرۆڤی هۆشیار پێویستە، سێ بازنەی پەیوەندیی پتەوو ڕێکوپێك بەڕێوە ببات ئەویش:

١- پەیوەندی لەگەڵ بەدیهێنەری مرۆڤ، کە پەیوەندییەکی بەندایەتییە.

٢- پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی هاوڕەگەزی خۆی لە مرۆڤایەتیدا، بەدەر لە هەر هەڵاوێردکردنێك وەك (ئاین، نەتەوە، ڕەگەز، ئایدۆلوجیا............هتد ). کە پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕی سوودو مرۆڤدۆستییە.

٣- پەیوەندی لەگەڵ ئەو شتانەی دەوروبەری (گیانداران، ژینگە، نیشتمان...........) کە پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕی سوودو ژیاندۆستییە.

* بازنەی یەکەمی ئەم پەیوەندییە، کە پەیوەندییەکی پەرستشو بەندایەتییە، بە پێی ئەو ڕێساو یاسایانە دەبێت، کە خودا لە ڕێگای پەیامبەرەکانیەوەو لەناو ئەو پەرتووکە ئاسمانییانەدا کە بۆی ناردووە، ڕوونی کردوەتەوە کە بنەماکانیو خاڵە سەرەکییەکانی تێیدا باس کردووە، بەڵام بەشێکی زۆری وازی لێهێناوە بۆ تێگەشتنو لێکدانەوەی مرۆڤەکان، بەپێی بنەمای (الأصل فی الإشـیاء الإباحة)، واتە: ئەسڵ لە شتەکان ڕێگەپێدراونو درووستن، تەنها ئەو شتانە نەبێت، کە خودا بە دەقی نەگۆڕ (قەتعیو ورودو قەتعی دلالـە) حەرامی کردوون، کە ئەو پانتاییەش لە چاو پانتایی فراوانیی حەڵاڵ، زۆر کەمو سنووردارن.

جەوهەرو ناوەڕۆکی ئەم پەیوەندییە ڕەنگدانەوەی لەسەر تەواوی ئاکارو هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان دەبێت؛ چونکە لە هیچ شوێنێکی قورئاندا نەهاتووە، باسی ئیمان هەبێتو یەکسەر بە شوێنیدا باسی کرداری چاکە نەهاتبێت. بەو شێوەیە کاریگەری لەسەر بازنەی پەیوەندییەکانی دیکە دەبێت بەشێوەی ئەرێنی.

* بازنەی دووەمی پەیوەندی، پەیوەندیی هاوژینیو هاوکاریو ئاڵوگۆڕی بەسوودە.

ڕێنماییەکانی پێغەمبەر (دروودو سڵاوی خودای لێ بێت)، فێرمان دەکات کە گرنگی بە مرۆڤەکانی بەرامبەرمان بدەین، تەنانەت لەو کاتەی کە خەریکی ئەنجامدانو کاری پەرستش بین، دەبێت ئازارو پێداویستیی ئەوی دی لەبەرچاو بگرین، وەك لە فەرموودەدا هاتووە (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ فَإِنَّ فِيهِمْ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَذَا الْحَاجَةِ، وَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە پێشنوێژی بۆ خەڵکی کرد، با درێژی نەکاتەوە؛ چونکە لەناو نوێژخوێناندا، لاوازو نەخۆشو پیرو پەککەوتە هەیە، ئەگەر نوێژی بە تەنها کرد، ئەوا با چەندە دەتوانێت درێژی بکاتەوە. لە بەر ڕۆشنایی ئایەتی پیرۆزی قورئاندا کە دەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ الإسراء: ٧٠، واتە: خودا ڕێزی لە هەموو مرۆڤەکان ناوە، وەك نەوەی ئادەم، نافەرموێت ڕێزم گرتووە تەنها لە موسڵمانەکان کە ئەم بابەتە ڕوونکردنەوەو لەسەروەستانی زیاتری دەوێت، لە بەشی کۆتایی ئەم باسەدا باسی دەکەین بە پشتیوانی خودا.

* بازنەی سێیەمی پەیوەندی، پەیوەندیی مرۆڤە لەگەڵ دەوروبەری (گیانداران، ژینگە...........هتد)، کە پەیوەندیی ئاوەدانکردنەوەو پاراستنو گەشەپێدانە، ئەمەش میکانیزمێکی ترە بۆ قووڵبوونەوەی مرۆڤدۆستیو نەرمونیانی بەتایبەت لای نەوەی نوێ، لە ڕێگای سۆزو ئەوین لەگەڵ گیانلەبەران کە لە ژینگەیەکی هاوبەشدا دەژین، بۆ ئەمەش سەرنج بدە لە فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێت) دەفەرموێت: (أَنَّ رَجُلًا رَأَى كَلْبًا يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَأَخَذَ الرَّجُلُ خُفَّهُ، فَجَعَلَ يَغْرِفُ لَهُ بِهِ حَتَّى أَرْوَاهُ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَأَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ) ئیمامی موسلم ڕیوایەتی کردووە.

واتە: پیاوێك، سەگێکی تینووی بینی، کە لە نزیك بیرێکی ئاوەوە، لە تینوێتیدا قەپی بە خۆڵی تەڕی نزیك بیرەکەدا دەکرد، پیاوێك لەو شوێنەدا بوو، زانی ئەو سەگە، تینوێتی زۆری بۆ هێناوە، بە پێڵاوەکانی ئاوی لە بیرەکە دەرهێناو تێر ئاوی کرد.........) لە پاداشتی ئەو کارەدا، خودا لێی خۆش بوو خستیە بەهەشتەوە، لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتووە کە ئافرەتێك چووە دۆزەخ (بەهۆی ئەوەی پشیلەیەکی زیندان کردو خواردنی پێ نەدا، تا مردار بووەوە)، ئەم فەرموودەیەش زۆر ڕوونو بیستراوەو ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە.



# تایبەتمەندیەکانی وتاربێژی سەرکەوتوو

ن: د.طارق السویدان و: فێنك جمال

وتراوە: نیوەی مرۆڤ زمانیەتی، نیوەکەی تریشی دڵیەتی، ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها هەندێك گۆشتو خوێنە.

گەر دەتەوێت ببیت بە وتاربێژێکی سەرکەوتوو، ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکە:

**١- زانستو زانیاری:**

زۆر گرنگە بۆ وتاربێژ، زانیاریی تەواوی هەبێت، لەسەر ئەو بابەتەی کە دەیەوێت لەسەری بدوێت، بتوانێت بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا، زانیارییەکانی بگەیەنێت بە بیسەر، گەر وا نەبێت، کەموکوڕ دەردەکەوێتو بەئاسانی لەلایەن گوێگرانەوە، هەستی پێ دەکرێت؛ چونکە بەبێ زانستو زانیاری، ناتوانێت وتارێکی سەرکەوتووانە پێشکەش بکەیت.

**٢- ئامادەکاریی باش:**

بەدەر لە زانستو زانیاری، وتاربێژ پێویستە گرنگی بدات بە ئامادەکردنو پێداچوونەوەیەکی تەواو بە وتارەکەیدا، هەروەها ئامادەکردنی ئەو بابەتەی کە دەیەوێت لەسەری بدوێت؛ چونکە بەم شێوەیە باشتر دەگات بە گوێگرانو سەرنجیان ڕادەکێشێت.

**٣- شارەزایی زمانەوانی:**

وتاربێژ، دەبێت زمانێکی ڕەوان بەکار بهێنێت، بۆ گوێگران کە لەگەڵ زمانی جەستەیدا بگونجێت، وشەکانیش بە ڕێگەیەکی باشو داهێنەرانە دەرببڕێ، پەیامبەرﷺ: (أُوتِيتُ جَوامِعَ الْكَلِم).

**٤- گەیاندنی پەیامێکی گرنگ:**

زۆرینەی ئەو وتارانەی کە ئامانجێکی دیاریکراویان تێدا نییە، لاوازو بێکاریگەر دەردەکەونو نابن بە جێی سەرنج، بەڵام پێویستە وتاربێژ، ئامانجی سەرەکی دیاری بکات بە شێوەیەك کە دەست لە ڕۆحی گوێگران بدات، کە سەرنجو گرنگیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت.

**٥- باوەڕبەخۆبوون:**

وتاربێژی نایاب، باوەڕی تەواوی بە خۆیەتی، بێگومان بەم هۆیەوە بە تەواوی دەگاتە مێشكو دڵی گوێگر، خاوەنی کەسێتییەکی جێگیرەو زیاتر ئامانجەکان دەپێکێت.

لە بیرت بێت سێ شت هەیە، بۆ وتارێکی سەرکەوتووانە: کێ پێشکەشی دەکات؟ چۆن پێشکەشی دەکات؟ چی پێشکەش دەکات؟

**٦- ڕاستگۆیی:**

یەکێکە لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی وتاربێژی نایاب، هەستکردنو ڕاستگۆییو ئەمانەتپارێزی، ڕاستگۆیی لە وتاربێژیو دەربڕیندا، چەند خاڵێکن وتاربێژی نایاب نەبێت، ناتوانێت بیپێکێت.

**٧- گرنگیدان بە جەماوەر:**

وەکو وتراوە: (قسە لەگەڵ خەڵکدا بکەن بە پێی ئەقڵیان)، پێویستە لەسەر وتاربێژ بزانێت قسە بۆ چ جۆرە کەسانێك، یاخود چینێك لە خەڵکی دەکات، بە زمانی خۆیان ڕوونکردنەوە بدات، هەروەها بزانێت بابەتی گونجاو چییە بۆ ئەوان.

**٨- گوێگرێکی باش:**

هەروەکو چۆن کە پێویستە وتاربێژێکی باش بێت، بە هەمان شێوە دەبێت، گوێگرێکی باش بێت، پێویستە شارەزاییەکی تەواوت هەبێت لە چۆنێتیی گوێگرتن لە خەڵکیو چۆنێتیی بەدەستهێنانی متمانەیان.

**٩- باوەڕبوون بەوەی کە دەیڵێت:**

هەروەها پێویستە وتاربێژ نموونەیەکی زیندوو بێت بۆ گوێگرەکانی، پێشەنگ بێتو یەکەم کەس بێت لە جێبەجێکردنی وتەکانیدا.



# زاراوەكانی بازرگانیی نێودەوڵەتی

محەمەد هاشم محەمەد
















زاراوەكانی بازرگانیی نێودەوڵەتی (مصطلحات التجارة الدولية) (INCOTERMS)

زاراوەكانی بازرگانیی نێودەوڵەتی (INCOTERMS) بریتییە لە: چەند بڕگەیەك (زاراوەیەك) كە دەرچووە لە (ژووری بازرگانیی نێودەوڵەتی) (International Chamber of Commerce – ICC)، ئەم بڕگانە بەكار دێت بۆناوخۆ و دەرەوەی هەر وڵاتێك، كە كرداری بازرگانی (كڕین و فرۆشتن)، یان هاوردە و هەناردەی تێدا ئەنجام بدرێت، لە لایەن هەموو وڵاتانی جیهانیشەوە جێگای باوەڕەو بە یاسایەكی تایبەتی خۆی ڕێك خراوە و ناتوانرێت پشتگوێ بخرێت لەكاتی كڕین و فرۆشتنی هەرشتێك لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات.

## مێژووی (INCOTERMS)

سەرەتا لە ساڵی ١٩٣٦و لە (ژووری بازرگانیی نێودەوڵەتی - ICC) لە پاریس دەرچووە، (١٠) ساڵ جارێك چاوخشانەوەو بەدواداچوونی بۆ دەكرێت و تا ئێستا (٨) جار ڕیڤایس كراوەتەوە، بۆیە دواجاری لە ساڵی (٢٠١٠) دەرچووە و لەبەردەستماندایە و تائێستا ئیشی پێ دەكرێت،

درووستبوون و هاتنە كایەوەی ئەم بڕگەو زاراوانە لە ئەنجامی ئەو پەیوەندی و پێویستیانەی كە لەنێوان بازرگانەكان (التجار) ڕوو دەدات، مەبەستمان بە بازرگان (كڕیارو فرۆشیار – البائع والمشتری – Buyer & Seller) (هاوردەو هەناردە – الاستیراد والتصدیر – Importer & Exporter).

مەرجەكانی ڕادەستكردن (شروط التسليم – Delivery Terms) لە بازرگانیی نێودەوڵەتیدا، بە گرنگترین بڕگە دادەنرێن، كە لە هەموو گرێبەستێكی (كڕین وفرۆشتن)دا بوونی هەیە، لە نێوان (كڕیار و فرۆشیار) لە كاتی ڕێككەوتن و

کردنەوەی (Letter of Credit - L/C) (الاعتماد المستندي) واتە : پشت بەستن بە نووسراوی بانکی، کە تێیدا دیاریکردنی وردەکاری و چۆنێتیی مامەڵەکردن و پەیوەندی و نێوان (کڕیار و فرۆشیار) دەخاتە ڕوو لەبارەی بە کرداری ئاڵو گۆڕکردنی کاڵاو کەرەسەکان (تبادل البضائع) (GOODS) لە دوو بواری زۆر گرنگدا:

١- نرخ و تێچووی کاڵا و کەرەستەکان لە:

A. نرخی ڕاستەقینەی کەرەستەکان.

B. هەر تێچوویەکی تر هەبێت و بخرێتە سەر نرخی ڕاستەقینەی کاڵا و کەرەستەکان، لە گواستنەوە و بارکردنو داگرتن و دڵنیابوون و ...هتد.

٢- بەر پرسیارێتی (Responsibility- المسؤولية) ئەو کەرەستانە، واتە: کەی بەرپرسیارێتیی کەرەستەکان دەگوازرێتەوە لە فرۆشیارەوە بۆ کڕیار، ئەو خاڵەی کە هەردووکیان ڕێککەوتوون لەسەری و کۆتا شوێنە کە کرداری پێدان و وەرگرتنی مەوادەکانی تێدا ئەنجام بدرێت، چونکە پێویست دەکات هەر یەکێکیان (کڕیارو فرۆشیار)، بزانن تا ئەو خاڵەی کە دیاری کراوە (نقطة تسليم البضاعة) تێچوو دەبێتە چەند؟ مەسرەفەکان چەندن؟ بەرپرسیارێتی کامیان کۆتایی پێدێت و بەرپرسیارێتی ئەوی تر دەست پێ دەکات؟

(INCOTERM2010) کە دوا ڤێرژنە و تا ئێستا ئیشی پێ دەکرێت لە (١١) زاراوە پێك دێت و لەسەرەتای ساڵی (٢٠١١) یەکەم بەکارهێنانی بوو، وێنەی سوفت کۆپیو هارد کۆپی هەیەو دابین کراوە لە (١٠٠) ژووری بازرگانی جیهانی لە گشت وڵاتەکان.

لێرەوە ئەو نووسراوەی کە دەرچووە لە (ژووری بازرگانی نێودەوڵەتی) (International Chamber of Commerce – ICC) لە ساڵی ٢٠١٠ لە پاریس، زاراوەکانی بازرگانی (شروط التسليم)ی دابەش کردووە بەسەر (٢) دوو گروپەوە کە لە (١١) زاراوە پێك دێت.

گرووپی یەکەمی زاراوەکان: تایبەتن بە شێوازی گواستنەوەی مەوادو کەرەستەو کاڵاکان لە ڕێگای دەریا وڕێگای ئاوییە ناو خۆییەکان، ئەمانەش پێك دێن لە (٤) زاراوە : (FOB,CIF,CFR,FAS).

گرووپی دووەمی زاراوەکان: تایبەتن بە گشت شێوازکانی گواستنەوە لە ڕێگای هەموو شێوازەکانی گواستنەوە (دەریا، ئاسمان، ووشکانی) ئەوانیش پێك دێن لە (٧) زاراوە (EX-WORK, FCA, CPT,CIP,DAT,DAP,DDP).

## هەندێ لە پێناسەکانی کرداری گواستنەوە (Transportation Definitions)

هەموو کردارێکی گواستنەوە بە (٣) سێ قۆناغ تێدەپەڕێت لەکاتی بارکردن لەکۆگاکانی فرۆشیار لەووڵاتی فرۆشیار، تا دەگاتە کۆگاکانی کڕیار لە ووڵاتی کڕیار، لێرەوە باس لەو (٣) سێ قۆناغە دەکەین:

١ (Pre-Carriage□ – سەرەتای گواستنەوەکان لە وڵاتی فرۆشیار.

٢- دووەم قۆناغ پیێ دەگوترێت (Main Carriage). گواستنەوەی سەرەکی لەنێوان ووڵاتی فرۆشیار ووڵاتی کڕیار.

٣- سێیەم قۆناغ پیێ دەگوترێت (On Carriage). کۆتایی گواستنەوەکان لە وڵاتی کڕیار.

| 1- Pre-Carriage | 2-Main Carriage | 3-On Carriage |
| --- | --- | --- |
| Seller Warehouse<br>کۆگاکانی فرۆشتیار لە وڵاتی فرۆشیار<br>مخازن البائع في بلد البائع (ميناء المغادرة)<br>وسائل واجراءات النقل في بلد البائع (المصدر)گواستنەوەی ناوخۆیی (Domestic) لەوشوێنەی کە کەرەستەکان باردەکرێن دەست پێدەکات بۆ ئەو شوێنەی کە (شحن) دەکرێت لە وڵاتی فرۆشیار.<br>گواستنەوەی نێودەوڵەتی (International) لەوشوێنەوە دەست پێدەکات کە کەرەستەکان باردەکرێن (شحن) لە وڵاتی فرۆشیارەوە بۆ وڵاتی کڕیار، واتە بۆ شوێنی گەیشتنی کەرەستەکان (مكان وصول البضاعة). | Port الميناء<br>ڕێگاکانی گواستنەوەی (ئاسمانی – دەریایی – وشکانی)<br>وسائل النقل (جواً – بحراً – براً)<br>وهي الطريق من ميناء المغادرة حتى ميناء الوصول<br>بریتییە لەو ڕێوشوێنانەی لە دوای قۆناغی (Pre-Carriage) ـەوە دێتو لەوخاڵەی کە کەرەستەکان باردەکرێن لە وڵاتی فرۆشیارەوە دەست پێدەکات، تا گەیشتنی خاڵی دیاری کراو لە وڵاتی کڕیار. | Bayer Warehouse<br>کۆگاکانی کڕیار لە ووڵاتی کڕیار<br>مخازن المشتري في بلد المشتري (ميناء الوصول)<br>وسائل واجراءات النقل في بلد المشتري (المستورد)<br>بریتییە لەو ڕێوشوێنانەی لە دوای قۆناغی (Main Carriage)ـەوە دێتو لە خاڵی گەیشتنی کەرەستەکان بۆ وڵاتی کڕیارەوە دەست پێدەکات. واتە: لێرەوە گواستنەوەی کەرەستەکان دەست پێدەکات. |
| International Transportation ئەم سێ قۆناغە پێی دەگوترێت گواستنەوەی نێودەوڵەتی | | |




# Free Marketing

# بازاڕسازی لە ڕێگای نموونەی بێبەرامبەرەوە

## (گوێزانی جولێت وەك نموونە)

دەستپێك: پاش شۆڕشی پیشەسازیو شۆڕشی تەکنەلۆژی، یەکێك لە کێشەکانی وڵاتانی بەرهەمهێن، ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیانە، لەم پێناوەدا لە ناوخۆو دەرەوەی وڵاتدا، بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیان، چەندان جۆر پلانو شێواز بەکار دەهێنن، لە هەمبەر وڵاتانی دەرەوەدا. یەکێك لە سیاسەتەکانیان بریتییە لە: نغرۆکردنی بازاڕی نیشتمانی ئەو وڵاتانە، لە ڕێگای پڕکردنی بازاڕەکانیان بە کاڵای هەرزان بەها، لە ئەنجامدا زۆرێك پیشەی میللییەکانی ئەو وڵاتانە، دەپووکێنەوەو لە ناودەچن، دیارترین لایەنی ئەو دیاردەیە لە کۆمپانیا زەبەلاحەکانو جیهانگیریدا دەبینرێنەوە.

بەو پێیەی لە ئێستادا، کوردستان هەموو شتێك هاوردە دەکات، لەم بوارەداو لە نووسینەکانی پێشترو ئێستاشدا تەنها مەبەستم پیشاندانی بیرۆکەکەیە؛ چونکە هەروا بە ساناو لە خۆڕا ئێمە ناتوانین ببین بە وڵاتێکی بەرهەمهێن، بەڵام ئێمە ئەگەر داهێنەرنەبین، دەکرێت چاولێکەرێکی باشبین، بەتایبەت لە پێناو گەشەکردن بە بازاڕو فرۆشی بەرهەمە ناوخۆییەکاندا، دەتوانین بەشێوەیەکی گونجاو، لەگەڵ کڕیاری خۆمانەدا مامەڵە بکەین، تا هێندە هۆشیاربێت، بەرهەمی خۆماڵی لە کاڵای بیانی لا شیرنتر بێت، بەم شێوەیە دەتوانین، تا ڕادەیەکی زۆر، پارێزگاری لە بەرهەمی خۆماڵی بکەینو ژمارەیەکی باشی هێزی کاری وڵاتەکەمان بەگەڕ بخەین، بەتایبەت چاوپۆشین لە قازانجی زۆر، قۆرخنەکردنی بازاڕ بە شێوازی ناقانوونیو دوور لە بەها ئاینیو کۆمەڵایەتییەکانو ... هتد.

ئەوەتا یەکێکی وەکو (حسێنی خەلیقی) لە پەرتووکی (کۆمەڵناسی کوردەواری)دا دەنووسێت، بازرگانەکانی کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بۆ گرانفرۆشی نموونەیان نییە!؟

یەکێك لە پێکهاتەکانی (ئاوێتەی برەودان) بانگەشەکردنە، لە دنیای ئەمڕۆدا، خاوەن بەرهەمەکان هەوڵ دەدن لە ڕێگای بانگەشەکردنەوە، زۆرترین بڕی بەرهەمەکانیان بفرۆشن، هاوکات بانگەشەکردنەکە بەشێوەیەك زۆرترین کاریگەری لەسەر کڕیار هەبێت، هەندێ خاوەن بەرهەم، بەشێوەیەك کڕیار لە بەرهەمەکانیان دڵنیا دەکەنەوە، سەرەتاو بەمەبەستی تاقیکردنەوە، بەبێ بەرامبەر نموونەی بەرهەمەکانیان ڕادەستی کڕیار دەکەن، تا دواتر ببن بە هەمیشەکڕیار.

بێگومان گشت بیرۆکەیەك لە ژیاندا، زادەی پێداویستیو تەنگەژەیەك بووە، هەموو داهێنانێك پێداویستیەکی گەورەی لە پشتەوەیە.

سەرەتا، با بزانین بیرۆکەی گوێزانی (جولێت) چۆن سەری هەڵدا، کە ئەمڕۆ لە ناوەندی بازاڕدا بووە بە سمبولێكو زۆرێك لە خاوەن بەرهەمەکان بە هیوای مانەوەیان لە بازاڕی کارو ڕکابەریدا چاوی لێدەکەنو شوێن هەنگاوەکانی دەکەون.

ئەورۆ خەڵکی جیهان، بە گشتی دەزانن (جولێت) ئامێرێکی

ڕیشتاشینی بەناوبانگە، ئەو ئامێرە داهێنراوی کۆمپانیایەکە واتای (تەراشێکی دڵنیا) دەگەیەنێت، هەروەها واتای ئەو گوێزانەیە کە دەتوانرێت بگۆڕدرێت، بەڵام ژمارەیەکی کەم دەزانن کە دامەزرێنەرەکەی (گینگ کامپ)ـە، داهێنانەکە جۆرێکی نوێی لە بازاڕسازی داهێنا، ئەویش بازاڕسازییە لە ڕێگای نموونەی بێبەرانبەر (خۆڕاییە) وە Free Marketing.

کاتێك (کینگ) داهێنراوەکەی داهێنا، تەمەنی تەنها چل ساڵ بوو، ڕۆژێك تەراشی دەکرد، تەماشای کرد مووسەکەی کول بووە، هەوڵیدا دەمەزەردی کاتەوە، هەوڵەکەی بێئاکام بوو، بەشێوەیەك گوێزانەکە بە دەستییەوە شکا! لێرەدا (کینگ) دوو بیرۆکە بە هزریدا هات:

یەکەم: درووستکردنی ئامێرێکی تەراش، بەشێوەیەك بتوانرێت دەمەکەی بە یەکێکی نوێ بگوڕدرێت؛

دووەم: دانانی دوو گوێزان لە تەنیشت یەکەوە، لە ئامێرێکی تەراشدا.

ئەم بیرۆکەیەی لە ئامۆژگاریی بەڕێوەبەرەکەیەوە وەرگرت کە داهێنەری ئەو شوشانەبوو، دەمیان (سەریان) بە پارچەیەك تەپەدۆر دادەخرێت. ئامۆژگارییەکە ئەوە بوو کە شتێك دابهێنێت خەڵك بۆ ماوەیەك بەکاریبهێننو پاشان لە کۆڵی بکەنەوە.

دوای پێنج ساڵ لێکۆڵینەوەو توێژینەوە بۆ درووستکردنی موسێکی تیژی بچووکی هەرزان، هەوڵەکەی (کینگ) بەری گرت، توانی ئامێرێکی تراش درووست بکات، گشت ئەو مەرجانەی تێدا بێت کە گەرەکی بوو. دواتر بۆئەوەی پارێزگاری لە بیرۆکەکەی بکات بیری لە دامەزراندنی کۆمپانیایەك کردەوە، ساڵی (١٩٠١) کۆمپانیای ئەمریکی بۆ تەراشی ئاسان (دڵنیا) درووست کرد، ساڵی دواتر ناوی کۆمپانیاکەی گۆڕی بۆ (جولێت)، بەڵام ئایا کەس کڕیاری بەرهەمەکانی بوو؟ نەخێر! ساڵی (١٩٠٣) یەکەم بەرهەمی کەوتە بازاڕەوە کە تەنها (٥١) ئامێرو (١٦٨) دەمە مووسی فرۆشت.

لەو کاتەدا بیرۆکەیەك بە مێشکیدا هات، بریتی بوو لە: دابەشکردنی ئامێری جولێت بە خۆڕایی، یان بە نرخێکی هەرزان، تا خەڵك بتوانن بەرهەمەکە بەکار بهێنن، بەتایبەت پاش ئەوەی جۆری یەکەمیان بەکارهێنا، لە نێو ئەو کڕیارانەی گوێزانی جولێتیان پێ بەخشرا، سوپای ئەمریکا بوو.

بۆ تەواوکردنی باسەکەم دەتوانم نموونەی زیاتر بخەمە پێشچاو، ئایا دەزانیت سەرەتا ئۆتۆمبێلی یابانی نرخی هەرزان بوو، بەڵام پارچەی یەدەکیان، نرخی شێتانەی لەسەر دانرابوو، ئەو کات کارێکی دانایی بوو، ئەگەر کڕیار لەبری ئەوەی پارچەیەکی یەدەك بکڕێت، ئۆتۆمبێلێکی نوێی کڕیباو بۆ سوودوەرگرتن لە پارچەکانی هەڵیوەشاندبا، بەڵام بلیمەتی یابانییەکان لەوەدا بوو، کاتێك پارچە یەدەکەکان هەڵدەوەشێنران کەڵکیان نەدەما.

باشە چیرۆکی کۆمپانیای (ستاندار ئۆیل)ت ژنەوتووە، خاوەنەکەی (جۆن ڕۆکفلر) لەسەدەی ڕابوردوودا هەستا بە بەخشینی هەشت ملیۆن گڵۆپی کیرۆسین، بێ بەرامبەر بە وڵاتی (چین)، ئەو کات خەڵکی ئەو وڵاتە شادومان بوون بەو سەخاوەتەو دەستیان کرد بە بەکارهێنانی گڵۆپی کیرۆسین؛ چونکە تیشکی گڵۆپەکە بە هێزبوو، پاش ئەوەی خەڵك ڕاهاتن لەسەر بەکارهێنانی، بەناچاری بوون بە کڕیارێکی باشو (جۆن ڕۆکفلر)یش داراییەکی زۆری کەڵەکە کرد.

هاوڕێ دەزانیت کاتێك گۆرانیبێژی ڕەشپێستی ئەمریکی (برینس)، هەستا بەبڵاوکردنەوەی (C.D) دوا ئەلبوومی لەگەڵ یەکێك لە ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی وڵاتی بەریتانیا، ئەویش ڕۆژنامەی (دەیلی میل) بوو.

(برینس) لە بەرامبەر بڵاوکردنەوەی دووملیۆنو هەشت سەد هەزار(C.D)دا، نزیکەی ملیونێك دۆلاری دەست کەوت. ئەو کارەش بە ماوەیەکی کەم، بوو بەر لە سازکردنی ئاهەنگێك لە پایتەختی وڵاتی بەریتانیادا، لە ئەنجامداو لە ڕێگای فرۆشتنی کارتی بەشداربووانی ئاهەنگەکەوە (٠٠٠ ٤٠٠ ٢٣$)ی دەستکەوت کە ژمارەیەکی پێوانەیی بوو، هاوکات هەمان ڕۆژ (٢٠٪) فرۆشی ڕۆژنامەکە بەراورد بە ڕۆژانی ڕابوردوو زیادی کرد.



# قشقەڕەو هەڵۆ

ڕۆژێــك لــە ڕۆژان، قشــقەڕەیەك هەڵۆیەكی دی، نیشــتە سەر بەرخۆلەیەكو كردی بە نێچیرە چەورەیو لەگەڵ خۆیدا بردی بەرەو ئاسمان.

قشــقەڕەكە، بیــری لە هەڵۆكە كــردەوە، كە چۆن نێچیرەكەی، لەگەڵ خۆیدا، بەرەو ئاســمان برد.. ئیدی وای زانــی، ئەمیش دەتوانێت، كارێك كە هەڵۆكە كردی، ئەنجامی بداتەوە.

ڕۆژێك، قشــقەڕەكە بە لای ڕانەمەڕێكدا تێپەڕی، سەیری كرد، شوانەكەی لێ نییە، لەبەر ئەوە قشقەڕەكە، هەر وەكو هەڵۆكە، بە ئاسمانی سەر ئاستی ڕانەمەڕەكەدا ســووڕایەوە، پاشــان لە ئاســمانەوە، چاوی خستە سەر بەرخۆلەیەكو هەروەكو هەڵۆكە هێرشی بۆ بەرخۆلەكە هێنــاو چڕنووكەكانی لە پشــتی بەرخۆلەكە گیر كردو ویستی بیبات بەرەو ئاسمان.

دیارە قشــقەڕە، بە ئەندازەی هەڵۆ، هێزو توانستی نییــە، لەبەرئەوە نەیتوانــی بەرخۆلەكە بەرز بكاتەوە. قاچەكانیشــی لە خوریی بەرخۆلەكــەدا گیر بووبوون.. ئیدی قشقەڕەكە نەیتوانی بفڕێت.

شوانەكە لەپڕ دەركەوت، تەماشای كرد، قشقەڕەكە بە بەرخۆلەیەكەوە چەسپیوە.

شوانەكە، پەڕوباڵی قشــقەڕەكەی كردو بردییەوە بۆ منداڵەكەی خۆی.

منداڵی شــوانەكە پرسی: بابەگیان، ئەمە چ جۆرە باڵندەیەكە؟

شــوانەكە گوتــی: ڕۆڵەگیان، ئەمە قشــقەڕەیەكی بچووكە، كە وای دەزانی هەڵۆیەكی گەورەیە.

منداڵە چاوگەشــەكان، دەبێت هــەر كەس بەپێی توانــای خــۆی كار بــكات؛ بۆئــەوەی زیــان نەبینێت، پێشــینانیش فەرموویانە: بە قــەد بەڕەكەی خۆت، پێ ڕابكێشە.



# تای ڕۆماتیزمی

# Rheumatic Fever

١. هۆکارو بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە:

هەوکردنی گەروو دوو ئاڵووەکە (لەوزەتێن)، ئەگەر بەباشی چارەسەر نەکرێت، ڕەنگە دڵ تووشی چەندین کێشەو گرفتی مەترسیدار بکات!!

نەخۆشیی تای ڕۆماتیزمیی: بریتییە لە: لاوازییەك، کە لە بەرگرییە کۆئەندامدا ڕوو دەدات، پاش هەوکردنی دوو ئاڵووەکەو گەروو، بە جۆرێك بەکتریا، کە پێی دەوترێت: (Streptococci). پاش ئەمە هێرش دەکەنە سەر ماسولکەکانی دڵو کەسەکە نیشانەکانی شکستی دڵ (Heart failure)ی لێدەردەکەوێت، لەگەڵ ئەمەشدا کەسەکە تووشی هەوکردنی جومگەکان دەبێت. ئەگەر چارەسەرێکی تەواوی بۆ نەکرێت، ئەوا پاش چەند ساڵێك زمانەکانی دڵ تووشی ڕەقبوونو ئەستووربوون دەکەن.

بەشێوەیەکی سەرەکی، منداڵانی (٥-١٥) ساڵ تووشدەبن، سەرەڕای ئەوەی ئێستا ئەم نەخۆشییە لەنەماندایە لە ئەمریکاو ئەوروپادا، وەلێ تاکو ئێستە کێشەیەکی گەورەیە لە وڵاتانی کەنداودا، بە بڵاوترین نەخۆشیی دڵ دادەنرێت لە نێومنداڵاندا، کە منداڵ تووشی دەبێت (جگە لە نەخۆشییە زگماکییەکانی دڵ)و بە هۆکارێکی بنچینەیی مردنی منداڵو تێکچوونی دڵی دادەنرێت، بەتایبەت ئەو کۆمەڵگایانەی دانیشتووانەکانی هەژارنو خۆراکیان ناتەندرووستەو ژینگەکەیان تەندرووست نییە.

توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن، لە هەموو هەزار منداڵێکی وڵاتانی کەنداودا، سێ منداڵیان تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن، لە کاتێکدا لە هەموو سەد هەزار منداڵێکی ئەمریکیو ئەوروپی، تەنها پێنج کەسیان تووش دەبن... ئەمەش وامان لێدەکات گرنگی پێبدەینو زوو بەفریا بگەین!

٢. نیشانەو کاریگەرییەکان:

نیشانەکانی تای ڕۆماتیزمی، پاش (٢-٣)هەفتە لە هەوکردنی دووئاڵووەکەو گەروو دەردەکەون، هەندێجار پاش هەفتەیەك دەردەکەون. ئەگەر نەخۆشییەکە بەسووکی دەست پێبکات، ئەوا ڕەنگە نیشانەیەکی دیاری نەبێت، یاخود فەرامۆش بکرێت بێ گرنگیی پێدان.

ئەم نەخۆشییە دەبێتە هۆی:

بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیی(تا)، ئارەقکردنەوەو ڕەنگ پەڕیین.

جومگەکان: هەودەکەن، دەئاوسێن، سوور هەڵدەگەڕێن، گەرم دادێن، ئازاریان دەبێت لە کاتی جووڵەدا، جومگەکانی (ئەژنۆ، مەچەك، ئانیشك، پێ)، زیاتر تووش دەبن. ئەم نیشانانە پاش (١-٢) ڕۆژ دیار نامێنن.

هەوکردنی دڵ (Carditis)، کۆبوونەوەی شلە لە دەوری دڵ، کە دەبێت بە هۆی هەناسە سواریی بەتایبەت لە کاتی خۆماندووکردن، یان پاڵکەوتندا، دڵەکوتێ، سنگ یەشە.. هتد.

٣.چارەسەری تای ڕۆماتیزمیی:

یەکەم هەنگاو بریتییە لە: پشوودانی تەواوی ناو جێگای نەخۆشەکە، تاکو بە تەواویی تاکەی نامێنێت، لێدانی دڵو هێڵکاریی دڵی دەگەڕێتەوە باری ئاسایی. ئازاریی جومگەی نامێنێت.

دژەبەکتریا: باشترینیان پەنسلین (penicillin)ـە، ئەگەریش هەستیاریی هەبوو بە پەنسلین، ئەوا دەرمانی ئێریثرۆمایسین(erythromycine) هەمان ڕۆڵ دەبینێت. پێویستە بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بێت لەسەر ئەم دەرمانە، تەنانەت ئەگەر کەسەکە نیشانەکانیشی نەما، لەبەرئەوەی مەترسیی سەرهەڵدانەوەی هەمان نەخۆشی هەیە.

بڕێکی بەرزی ئەسپرین (aspirin) هەوکردنی جومگە ناهێڵێت.

دەرمانی کۆرتیکۆستیرۆدەکان (corticosteroids) زۆر بەخێرایی نیشانەکان ناهێڵێت.

٤. ئایا دەتوانین خۆمان بپارێزین؟

بەڵێ، بەدوو هەنگاو:

خۆپاراستنی سەرەتایی (Primary prevention): لە ڕێی چارەسەرکردنی هەوکردنی دوو ئاڵوەکەو قوڕگ بەو بەکترییە، پێش ئەوەی سەربکێشێت بۆ تای ڕۆماتیزمیی. تا ئێستاش باشترین دەرمان بریتییە لە: پەنسلین بۆماوەی دە ڕۆژ، تەنانەت ئەگەر نیشانەکانی هەوکردنیش دیارنەمان.

خۆپاراستنی دووەمی (Secondary prevention): ئەگەر لە هەنگاوی یەکەم سەرکەوتوو نەبووینو سەری کێشا بۆ تای ڕۆماتیزمیی، ئەوا پێویستە لە ژێر چاودێری پزیشکدا بۆماوەی چەند ساڵێکی زۆر (پەنسلین) بە دەرزیی وەربگرێت، تاکو بەتەواوی مەترسییەکە نامێنێت، هەندێ لە پزیشکانیش باوەڕیان وایە دەبێت بە درێژایی ژیان واز لەم دەرمانە نەهێنێت..!

ن: د. حسان شمسی پاشا --------- و: یەحیا محەممەد عەلی



# سوودەکانی بڕۆکلی

به شێوەیەکی گشتی، بڕۆکلی یەکێکە لە باشترینی خواردنەکان بۆ جەستەی مرۆڤ..

هەندێك لە خەڵکی، وا دەزانن تاکە ڕێگە بۆ خواردنی بڕۆکلی، پاش لێنانیەتی، بەڵام دەتوانرێت بە نوێیو بێ پیشاندان، یان بێ کوڵاندنی بخورێت، باشترین ڕێگەش بۆ سوودوەرگرتن لە بڕۆکلی، خواردنی گۆپکەکانیەتی، لەبەرئەوەی بڕێکی باش ئاوێتەی سەرەکیی چارەسەری تێدایە وەك سلفۆرافان.

ئەوەش جێگرەوەیەکی باشە بۆ ئەوانەی حەز بە بۆنو تامی بڕۆکلی ناکەن، لیکۆڵینەوەیەکی زانستی ئاماژە بەوە دەکات بڕێکی کەم لە بڕۆکلی، ڕێگری لە زیادبوونی گرێی مەمك دەکات، کە بەهۆی ماددە کیمیاییە شێرپەنجەییەکانەوە دروست دەبێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، گۆپکەی بڕۆکلی بە نوێیی بڕێکی باشی ئاوێتەکانی دژ بە شێرپەنجەی تێدایە، بێجگە لەمانە چەندین سوودی دیکەی هەیە:

**یەکەم: هەوکردنی جومگەکان:**

ئەزموونەکانی کۆتایی لەسەر خانەو شانەی مشکەکان، ئەوە دەردەخات بڕۆکلی دەوڵەمەندە بە گۆگرد، سلفۆرافان، ڕێگریکردن لەو ئەنزیمەی کە بەستەرەکان دەپچڕێنێت، هەروەها زۆرکردنی بڕۆکلی لەگەڵ ژەمە خۆراکییەکان یارمەتی هێواش کردنەوەو ڕێگریکردن لە لاوازبوونی ئێسکەکان دەکات.

هەردوو ماددەی (gluconasturtiian و glucobrassicin)کە دژەهەوکردنن،" هەوکردن هۆکاری بنەڕەتی نەخۆشییە درێژخایەنەکانە" هەروەها ماددەی (کایمبفیرۆل فلافونۆید)ی تێدایە کە دژی هەستیاریو هەوکردنن.

**دووەم: شێرپەنجە:**

سلفۆرافان لە بڕۆکلیدا، ڕەگی خانە شێرپەنجەییەکان لەناودەباتو ڕێگری دەکات لە گەشەی گرێی شێرپەنجە، گلۆکۆرفانین ئەنزیمی خانەکان بەهێز دەکات کە لە فەوتانی گەردی دەیانپارێزێت، ڕێکخستنی کرۆمۆسۆمەکان زۆر پێویستە لە کۆنترۆڵکردنی هەموو فەرمانەکانی لەش، هەروەها ترشی ناوەکی، ئەو کرمۆسۆمە نامۆیانە لەناو دەبات، وەك ئەوانەی پەیوەندییان بە نەخۆشییە ڤایرۆسییەکانەوە هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ترشی ناوەکی ناسرووشتی ڕۆڵێکی باش دەبینێت لە گەشەسەندنی هەموو جۆرەکانی شێرپەنجە.

**سێیەم: گوشاری خوێنو تەندرووستیی گورچیلە:**

سلفۆرافان لە بڕۆکلیدا گوشاری خوێنو فەرمانەکانی گورچیلە باش دەکات، لە تاقیکردنەوەیەکدا لەسەر ئەو مشکانەی گوشاری خوێنیان بەرزەو گورچیلەیان لە فەرمانەکانیاندا لاوازن، بە پێدانی ئاوێتەی سلفۆرافان، تێبینی باشبوونی فەرمانی گورچیلەکانو نزمی گوشاری خوێن کرا.

**چوارەم: باشکردنی تەندرووستی کۆئەندامی بەرگریو دژە پیربوون:**

هاندانی کۆمەڵەیەکی جۆراوجۆری دژە ئۆکسانەکان لە لەشدا، لەوانەیە ئۆکسان کەم بکاتەوە، هەروەها پاشەکشێی کۆئەندامی بەرگری هێواش دەکات کە لەبەرەو پێشچوونی تەمەن ڕوو دەدات.

**پێنجەم: تەندرووستی دڵ، بەتایبەتی تووشبووانی نەخۆشیی شەکرە:**

سلفۆرافان هانی بەرهەمهێنانی ئەو ئەنزیمانە دەدات، کە بۆرییەکانی خوێن دەپارێزن: ژمارەی ئەو گەردانەی دەبن بەهۆی فەوتانی خانەکان کەم دەکاتەوە، تووشبووانی نەخۆشیی شەکرە، زیاتر تووشی گەشەی نەخۆشییەکانی دڵو بۆرییەکانی خوێن دەبنەوە، وەك نۆرەدڵێو وەستانی مێشك، هەردووکیان پەیوەندی بە بۆرییە خوێنە فەوتاوەکانەوە هەیە. هەروەها کرۆمی تێدایە، کە یارمەتی تەندرووستی دڵ دەدات، هەروەها ماددەی لوتینی تێدایە یارمەتی ئەستور نەبوونی دەمارەکانی خوێن دەدات.

**شەشەم: کەمکردنەوەی ئاستی کۆلیسترۆڵی خوێن:**

بەهۆی ئەوەی بڕۆکلی ڕیشاڵی تێدایە کە توانای توانەوەیان هەیە، یارمەتی کەمکردنەوەی ئاستی کۆلیسترۆڵی خوێن دەدات.

**حەوتەم: بڕۆکلی ئاستێکی بەرز لە کالیسیۆمو پۆتاسیۆمی تێدایە:** هەردووکیان گرنگن بۆ تەندرووستی ئێسکو پاراستنی لە لاوازبوون.

**هەشتەم: بڕۆکلی دەوڵەمەندە بەو ڕیشاڵانەی یارمەتی کرداری هەرس دەدەنو قەبزی ناهێڵن:** پارێزگاری لە نزمکردنەوەی ئاستی شەکر لە خوێندا، ڕێگری لە زیادەڕوپکردنی خواردن دەکات؛ چونکە یەك قاپ بڕۆکلی، بڕێکی زۆر پرۆتینی تێدایە، هێندەی قاپێك برنج، یان گەنمەشامی لەگەڵ نیوەی یەکەکانی گەرمی.

**نۆیەم: تفتێتی لەش:**

وەك ژمارەیەك لە سەوزەکان، بڕۆکلی یارمەتی هێشتنەوەی تفتێو کەمکردنەوەی ترشێتی دەدات، کە چەند سوودێکی تەندرووستی هەیە بۆ هەموو فەرمانەکانی لەش.

**دەیەم: یارمەتیی تەندرووستبوونی چاو دەدات:** بەهۆی بوونی ئاستێکی بەرزی کارۆتینیدات وەك (اللوتین و زیاکسانپین).

**یانزەیەم: بەهۆی ماددەی (glucoraphanin)** یارمەتیی لابردنی ژەهری ناو لەش دەدات.

# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

## "مانگی پێنج"



**سیفەتەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی (٥) مایسدا لەدایکبوون:**

بێگومان ئێمەی مرۆڤ، هەر یەکەمان خاوەنی کۆمەڵێك سیفاتو ئاکاری تایبەت بە خۆمانین، هەڵسوکەوتی ئێمەی مرۆڤ، هەندێکی هاوبەشەو هەندێکی دیکەشی جیاواز.. واتە: هەر یەك لە ئێمە، خاوەنی جۆرێك ئاکاری تایبەتو نەریتی تایبەت بە خۆمانین، کە لە کەسانی دیکەمان جیا دەکاتەوە، زانایانی بواری دەروونناسی، جیاوازیی جۆری کەسایەتیو سرووشتو هەڵسوکەوتمان دەگێڕنەوە بۆ کۆمەڵێك هۆکار، یەك لەو هۆکارانەش، مانگی لەدایکبوونمانە، هەروەك لە سەرەتای ساڵی نوێوە بەڵێنمان بە خوێنەرانی ئەزیز دابوو، کە هەڵسەنگاندنەکانی ئەم ساڵ تایبەت بکەین بە مانگی لەدایکبوونەوە، لەم ژمارەیەدا باس لە سیفەتو هەڵسوکەوتەکانی ئەو کەسانە دەکەین، کە لە مانگی ئایاردا چاویان بە ژیان هەڵهێناوە:

**سیفەتە ئەرێنییەکانی ئەو کەسەی کە لە مانگی ئایاردا (٥) چاوی بە ژیان هەهێناوە:**

١- خاوەنی ئیرادەیەکی بەهێزەو هاندانەکانی کاریگەرن.
٢- خاوەنی بیرۆکەی بەهێزو زیرەکانەن.
٣- حەز دەکەن سەرنجی کەسانی دەوروبەریان ڕابکێشن!
٤- خاوەنی هەستی قووڵو بەهێزن!
٥- چێژ لە جوانیو جوانییە مەعنەوییەکان دەبینن.
٦- خاوەنی هەڵوێستی بەرزو بەهێزن، لە هەموو ڕووداوێکدا.
٧- پێویستیان بە هاندان نییە؛ چونکە خۆیان هانی خۆیان دەدەن.
٨- بە ئاسانی دڵنەوایی دەکرێن.
٩- کەسانێکی یاساییو بەبەرنامەن. (بەشی لای چەپی مۆخیان بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە).
١٠- خاوەنی خەونو هیواو ئاواتن.
١١- خاوەنی توانایەکی بەرزن، بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتنی بیرۆکەی کەسانی دەوروبەریان.
١٢- کەسانێکی تێگەیشتوونو توانای تێگەیشتنیان بەرزە.
١٣- خەیاڵو بیرکردنەوەکانی باشو پەسەندو واقیعین.
١٤- خاوەنی توانایەکی ناوازەن، لە گفتوگۆو مشتومڕدا.
١٥- بە شێوەیەکی گشتی، بەژنو باڵایەکی ڕێکو جوانیان هەیە.
١٦- حەز بە هونەرو ئەدەب دەکەن.
١٧- حەزیان لە گەشتو گەڕانە.
١٨- زۆر دڵسۆزانە کارو ئەرکەکانی سەرشانیان ڕادەپەڕێنن!
١٩- خاوەنی ڕۆحێکی جوانو بەرزن.

**سیفەتە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی ئایاردا (٥) چاویان بە ژیان هەڵهێناووە:**

١- کەسانێکی هەڵەشەنو کەم پشوو دەدەن.
٢- ڕقیان لە مانەوەیە لە ماڵدا.
٣- گرفتی هەناسەدانیان هەیە.
٤- زۆربەی جار دوچاری ئازاری سەرو قوڕگ دەبن.
٥- بە ئاسانی دەکەونە ژێر کاریگەریی دەوروبەریانەوە.
٦- زۆر بەئاسانی تووڕە دەبن.
٧- شێتگیرو کەللەڕەقو دڵڕەقن.
٨- دەستبڵاوو ئەبلەخەرجن!

خۆشەویستان، گەر بەوردی سەرنج بدەین، دەبینین سیفەتە ئەرێنییەکانی لەدایکبووانی مانگی (٥)، دوو هێندەی سیفەتە نەرێنییەکانن!

کەواتە: ئێمە نامانەوێت، لێرەداو لەم بابەتەدا تەنها ئاشناتان بکەین بە سیفەتە ئەرێنیو نەرێنییەکانو هیچی تر..

نەخێر بە پێچەوانەوە، ئێمە دەمانەوێت، ببینە ئاوێنەیەك، تا سیفەتەکان بە جوانو ناشیرینیانەوە پیشان بدەین، ئەو کات هەوڵی جوانکردنی سیفەتە ناشیرینەکان بدەینو جوانەکانیش جوانتر بکەین.

# ئێمە کار دەکەین، کەواتە: ئێمە هەین!

کارکردن؛ واتە: بوونی بەرهەمو بەردەوامیی ژیانو ڕوونیی ئایندەو گەشیی دڵو دەروونو پارێزگارییە لە سستیو تەمبەڵیو تەوەزەلی، ژیان واتە: هەوڵو تێکۆشان، ئەو کەسەی کارو پیشەیەك نەزانێتو سەرگەرمی کارکردن نەبێت، چۆن پێناسەی خۆی دەکاتو چۆن نرخی مرۆڤبوونی خۆی دەگرێت، گرنگ نییە کارەکەمان چییە، گرنگ ئەوەیە کار دەکەینو بە هەموومان ژیانمان بەرەو پێش دەبەینو دەستەبەری پێویستییەکانمان دەکەین، بەنناو نانەواو جوتیارو کرێکارو مامۆستاو ئەندازیارو دکتۆرو فیتەرو کارگوزارو... هتد، هەموویان گرنگو پێویستنو کەسیش لە کەس گەورەتر نییەو وەك دانەکانی شانە گرنگنو بە هەموانیش پەرچەمی کۆمەڵگە دادێننو داهاتوو دەسازێننو ژیان بەڕێوە دەبەن، وەك قانع لەم شیعرەدا دەڵێت:

کوڕی کوردم خەریکبن بێنە فەرمان
لە گۆڕنێن تەمبەڵیو بێکاریی جاران
ئارەق برژێ لەسەر خاکا لەبەر پێت
لە ڕێی ئیشکردنا بۆ بەرگو بۆ نان
مەڵێ عەیبە، مەڵێ ناچم بۆ سەر کار
مەڵێ ئاواتمە سەیرانو سەردان
برام عەیبی نییە شوانیو سەپانی
ئەبەخشن فەخرو شانازی بە ئینسان

بەڕاستی قانع جوانی فەرمووەو هەموو چینەکانی کۆمەڵگا گرنگیی خۆیان هەیەو بەتایبەت ئەوانەی کە ئەرکەکەیان گرانترەو ئارەق دەڕێژنو زیاتر ماندوو دەبنو دەستیان دەستی بەرهەمهێنانو بونیادنانە، شایانی ڕێزو ستایشنو پێغەمبەر(دروودو سڵاوی خودای لێ بێت) زۆر فەرموودەی شیرینی لەو بارەوە هەیەو تەنانەت جارێك لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکدا تەوقەی دەکرد؛ یەکێکیان دەستی شاردەوەو ویستی تەوقە نەکات، لێیان پرسی بۆچی وا دەکەیت؟ وتی چونکە دەستم بریندارو قڵیشاوەو نامەوێت دەستی پێغەمبەر ئەزێت بدەم، بەڵام پێغەمبەریش دەستی کرێکارەکەی گرتو ناو دەستی ماچ کردو فەرمووی (اليدُ العُلْيَا خيرٌ من اليدِ السُّفْلَى)، واتە: دەستێك کە لەسەرەوەیەو دەبەخشێو بەرهەم دەهێنێ، باشترە لەدەستێك کە لەخوارەوەیەو وەر دەگرێت).

ئێمە پێویستە چێژ لە کارکردن وەربگرینو بەدڵێکی خۆشەوە، بڕۆینە سەر کارو بزانین کە بێکاری دەردێکی گرانو کوشندەیە، کاریگەریی زۆر خراپ بەجێ دەهێڵێت لەسەر کەسێتیی مرۆڤ، هەر لەبەرئەوەشە لە کوردەواریدا هاتووە دەڵێت: (ئەگەر ڕۆیشتی بەبێگار، مەوەستە بەبێکار)، با وانەیەك لە هەنگو مێرووولەوە فێربین چەندە چوستو چالاکنو کەسیش مافی کەس زەوت ناکات، هەر کەسێك کارێك بکات، بەرهەمەکەی دەبینێتو ئەوەی دەیچێنێت دەیدروێتەوە، دەگێڕنەوە پاشایەك هەبوو هەر کەسە قسەیەکی جوانی بکردایە، دووسەد درهەم خەڵاتی دەکرد، ڕۆژێك پاشا دەسووڕایەوە، پیاوێکی پیری بەساڵاچووی بینی، خەریکی ڕواندنی درەخت بوو، پاشا پێی وت: بۆچی ئەو درەختە دەڕوێنی؛ کە دەزانی چەندین ساڵی دەوێت بێتە بەرهەمو ڕەنگە تۆ زۆر پێش ئەو ماوەیە بمریت؟ پیاوە بە تەمەنەکە وتی: ئەوانەی پێش ئێمە ڕواندیانو ئێمە خواردمان، ئێمەش دەیڕوێنین، تا نەوەکانمان سوودی لێ ببینن، پاشا ئافەرینی کردو ٢٠٠ درهەمی خەڵات کرد. پیاوە بەتەمەنەکە پارەکەی وەرگرتو پێکەنی. پاشا وتی بەچی پێ دەکەنی؟ پیاوە بە تەمەکەنەکە وتی: ئەم درەختە، دوای ٢٠ ساڵ بەر دەگرێت، ئەم درەختەی من ئێستا بەری گرت. پاشا وتی: ئەمەش قسەیەکی جوانەو ٢٠٠ درهەمی تریشی پێبەخشی. پیاوە بەتەمەنەکە دووبارە پارەکەی وەرگرتو پێکەنی، پاشا وتی بۆچی پێ دەکەنی؟ وتی ئەم درەختە لە ساڵێکدا جارێك بەر دەگرێت، بەڵام درەختەکەی من دوو جار بەری گرت؟ پاشا وتی: ئەمەش قسەیەکی جوانە، فەرمانیدا ٢٠٠ درهەمی تری پێ بدەنو بەخێرایی ئەو ناوەی بەجێ هێشت. وتیان: بۆ وا خێرا ڕۆیشتیت خاوەن شکۆ؟ وتی: ئەگەر بمابایەتەوە دەبوو هەمووماڵو سامانەکەم بدەم بەو پیرەمێردە.

دەبا هەمووان بەدڵسۆزیو باشی کار بکەینو هەوڵی ئاوەدانی بدەینو خاوەن کارەکانیش، مافی کرێکارەکان دابین بکەنو ڕێزو قەدرو نرخی ئەو دەستە بەرهەمهێنو بیناکەرانە بزاننو وڵاتی ئێمەش لە یەکی ئایاری هەموو ساڵێکدا کە ڕۆژی جیهانی کرێکارانە، زیاترو وردتر لە مافەکانی کرێکاران بکۆڵێتەوەو سەلامەتی ژیانو گوزەرانیان دەستەبەر بکاتو نەهێڵێت چینێك خوێنی چینێکی تر بمژێتو نەهێڵێت کەس لە مافەکانی بێ بەش بکرێت، بەو هیوایەی هەمووومان بۆ هەمووانی بکەینو دەستبارو هاوکارو پشتیوانی یەکتربین؛ بۆئەوەی کۆمەڵگایەکی بەختەوەرو ئاسوودەمان هەبێت.



زاهیر زانا



## بۆ کوڕو کچە لاوەکانم

## ٥٠ مۆم بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەتان

### مۆمی 33

# خۆتان لەترس بپارێزن

لـەم ژیانی دونیایەدا، ئەو سـەرچاوانە زۆرن، کە دەکرێت ڕووبەڕووی مەترسـیو گۆبەندمـان بکەنەوە، لەبەرامبەریشـدا پێویسـتیی مرۆڤ بۆ ئاسـوودەییو ئارامیو ئاشتی، لە پێویستی بـۆ خواردنو خواردنەوە، کەمتر نییـە، کەواتە: کوڕو کچەکانم، چۆن هەسـت بە ئاسوودەیی دەکرێت، چۆن خۆیان بەدوور بگرن لە ترسو پەشۆکاویی نەخوازراوو پەککەوتن؟

**لەم چەند دێڕەدا ئاماژەی پێ دەکەم:**

١. خـودای گەورە لە چەنـدان ئایەتدا، پێمان دەفەرموێت: بـاوەڕو چاکـە، دەبنە چەتـری ئارامی کـە لە دنیـاو دوارۆژدا پێویسـتمان پێیەتی، وەك دەفەرموێـت: ﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ البقرة: ٣٨ واتە: (وتمان: بە ئادەمو حەوا: بەهەشت بەجێ بهێڵنو دابەزن بۆ سەر زەوی، لە پاشاندا ئەگەر لەلایەن منەوە ڕێنومایيتان بۆ هات، هەر کەسـێك پەیڕەوی ئەو ڕێنومایيە بکات، لە پاشـەڕۆژدا نە ترس ڕوویـان تێدەکات، نە خەفەت دەخۆن). هەروەها دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴾ فصلت: ٣٠ ﴿ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴾ فصلت: ٣٢ واتە: (بەڕاسـتی ئەوانەی وتوویانە: پەروەردگاری ئێمـە زاتی خودایەو پاشـان نەلەخشـاوبوون، ئەوانە فریشـتە دێنـە خوارەوە بۆ سـەریانو پێیـان دەڵێن: لە هیچ مەترسـنو خەفەتی هیچ مەخۆنو خۆش مژدەبن بەو بەهەشـتەی لەسـەر زمانـی پێغەمبـەران گفتتـان پێ درابـوو. ئەمەشـتان لەلایەن خودایەکی بەخشندەی میهرەبانەوە بۆ ئامادە دەکرێت). هەروەها دەشـفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ الأنعام: ٨٢ واتە: (ئەوانەی باوەڕیـان هێناوەو هاوەڵدانان بـۆ خودایان تێکەڵ نەکردووە، ئەوانە بێ ترس دەبن لە سـزای ڕۆژی قیامـەت، ئەوانەن خودا هیدایەتی داونو ڕێگای ڕاسـتیان گرتووەتەبـەر). خراپەکـردن درز دەخاتـە ئاسـوودەیی، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴾ النحل: ١١٢ واتە: (خودا نموونەی دێیەکی هێمنو دڵنیـا دەهێنێتەوە، کە لە هەموو شـوێنێکەوە ڕۆزیی فراوانی بۆ دەهـات، جا ئەهلی ئـەو دێیە کوفرانـەی نیعمەتەکانی خودایان

کرد. خوداش، بەهۆی کردەوەکانیانەوە پۆشاکی برسێتیو ترسی پێ چەشـتن) هاوەڵ پەیداکردن بۆ خوداو سەرپێچیکردنی دایكو باوكو جەورو سـتەمکردن لە خەڵکی، گەورەترین سـەرچاوەی هەڕەشـەن لەسەر ئاسـوودەیی هەر یەکێکمان؛ کەچی باوەڕو چاکەکردن لەگەڵ درووسـتکراوانو ڕاسـتگۆییو دادپـەروەری فراوانتریـن دەرگاکانی ئاشـتەواییو ئاسـوودەییو میهرەبانین، سـووربن لەسەر ئەوەی ئەو ترسە بگۆڕن بە گوێڕایەڵیو خۆگری لەسەر فەرمانی خودای گەورە.

٢. ترس لە شکستخواردنو کەوتن، تا ڕادەیەك شتێکی باشە، گـەر ببێتە هۆی بنیاتنانی هەسـتی بەرپرسـیارێتیو هاندانتان لەسەر کارکردنو کارامەییو کۆڵنەدان، بەڵام ئەگەر گەشتە ئاستی خەم، دەبێتە شتێکی خراپو ئازاردەر، ئایا ئەمە ڕوونە؟

٣. با وا لە ژیان نەڕوانین؛ کە مەنزڵگای شـادیی نەبڕاوەو سەرکەوتنی بەردەوامو لەشساغی هەمیشەیی بێت.. بەڵکو شادیو خەمباریو جۆرەکانیشی تێدایە، پێویستە خۆمان سەرقاڵ نەکەین بەوەی کە ڕەنگە ڕوو بدات لە کارەسـاتو ناخۆشـییەکان، ئەمە جۆرێکە لە شکسـت لە کۆنتڕۆڵکردنی هەستەکاندا، دەرگایەکە بۆ کردنەوەی ترس بەبێ هیچ هۆیەکی گونجاو.

٤. هەمیشـە لەبیرتـان بێـت، خـودای گـەورە چەندێك یارمەتیو ئارامگری دەبەخشێت بەهەمان بڕیش قورساییو بەڵا، هـەر بۆیە با سـکاڵاکانمان ببەینە لای خـودا، دەبینین، کە هیچ پێویستمان بە خەم نابێت؛ بۆئەوەی لە داهاتوو ڕوو دەدات.

٥. پابەندبـوون بە ڕاسـتیو درووسـتیو دوورکەتنەوە لە درۆو فریودانو کەمتەرخەمی لە ئەنجامدانی ئەرکە جیاوازەکان.... لە هۆکارە پێویستەکانن بۆ هەستکردن بە ئاسوودەییو دوورکەوتنەوە لە ترس.

٦. ئاڵۆزیو گومانو نەزانیی سـەرچاوەیەکی گرنگی ترسن، دەتوانیـن خۆمان بپارێزین لەمانە، لە ڕێگەی زانسـتو زانیاریو تێگەشتنو سووربوون لەسەر ڕوونیو ئاشکرایی.

٧. داخڵی جۆرێك لە کێبڕکێ بن، کە مەترسییەکی ئەوتۆی تێدا نییە؛ چونکە ئەمە بڕوا بەخۆبوونتان زیاد دەکات، ئەو ترسە ڕاودەنێت، کـە لەئەنجامی زۆردانیشـتنو تەممەڵیو بێکارییەوە تووشـی دەبن، ئەم وتە چەندە جوانە: « ترسـنۆك هەر سـاتی جارێكو ئازاکانیش تەنها جارێك دەمرن!»



# ئەنجامی ڕەفتارەکانمان کەسایەتیمان دەناسێنن!

**بەڵێن ئەنوەر**

هەر بەرەنگاربوونەوەیەك لەم ژیانەدا، هەر قسەو کردارو گوفتارێك... هەمووی دەرئەنجامی ڕەفتارەکانی خۆمانە، "ئێمە خۆمان بنیاتنەرینو خۆمان ڕووخێنەرین"، بەڵام ئەوەی کە لە ئەسڵی بابەتەکان دوورمان دەخاتەوە، بریتییە لە: میکانیزمی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆی ئاکامی ڕووداوەکان لەسەر ڕووپەڕی حەقیقەتی ڕووداوەکان. مرۆڤی ژیر باکی نییە لەو ئاکامانەی کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی دەبنەوە؛ چونکە دەزانێت کە پەیوەندی هۆکاری هەیە لە نێوان ڕەفتاری خۆیو ئەو ئەنجامەی کە بەو هۆیەوە هاتۆتە دی، بۆیە لەم لایەنەوە پەیڕەویکردنی ڕێسای ئەنجامی ناڕاستەوخۆ لەسەر مرۆڤە ژیرەکان، کاریگەرییەکی ئەوتۆی نییە لەبەر ئەو هۆکارەی کە باسمان کرد. بەڵام ئەوەی جێی ئاماژە بۆ کردنە، بریتییە لە: ڕووبەڕووبوونەوەی ئەنجامە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆکان لەسەر لایەنەکەی دیکەی مرۆڤەکان، کە ئەویش ئەو کەسانەن کە کاتێك کردەوەیەك ئەنجام دەدەن بیر لە هیچ شتێك ناکەنەوە، تەنها ئەوە نەبێت کە خۆی مەبەستێتی، ئەم کەسانەش زۆربەی جار تووشی دوو حاڵەت دەبنەوە، یەکەمیان ئەوەیە کە بەبێ هیچ ڕاوێژێك ڕاستەوخۆ ئەوکارە ئەنجام دەدەن. دووەمیان کە گرێدراوی یەکەمیانە ئەویش ئەوەیە کە دڵنیان لەوەی کە ئەو (نیەت)و ئەنجامە دێتە بوونو کارەکە سەردەگرێ، لێرەدا دوچاری هەڵەیەکی گەورە دەبنەوە، ئەویش نەبوونی ڕاوێژی پێشوەختەیە لەبارەی ئەو ڕەفتارەی کە ئەنجامی دەدەن. پێویستە لە کاتی ئەنجامدانی کارێك، یان قسەیەکدا ڕەچاوی کاتی قسەو ئەنجامەکەشی بکرێت، پێویستە گرنگی بە قۆناغەکانی پێش کردارەکە بدەین؛ چونکە بەڕاستی هیچ ئەنجامێك بوونی نییە، ئەگەر ڕەفتارو قسەکانی منو تۆ، پێشتر ئاڕاستەی نەکردبێت. هەندێك کەس بەبێئاگاییەوە ڕەفتار دەکات؛ کاتێك واقعێك ڕووبەڕووی دەبێتەوە بەخێرایی بەرەو ڕووی دەچێت، بەبێئەوەی بوارێك بۆ خۆی بهێڵێتەوە وەکو پاشەکەوتێکی ڕەفتاری کە بتوانێت پشتی پێببەستێت لە کاتی دژوارییەکانی ئەنجامی ڕەفتارەکەی، کاتێکیش ئەنجامێکی خراپ دێتە ڕێگای، بەخێرایی تووشی شڵەژان دەبێت، ئەمەش ڕووبەڕووبوونەوەی سەختییەکانی پێش دوا قۆناغی ڕەفتارگەرایی ژیانزانییە، کە لێرەدا زۆر پێویستە ئەم دەستەیەی مرۆڤ، بیکەنە دەروازەی هزری ڕەفتارشوناسی؛ بۆئەوەی متمانەبەخۆبوونیانی پێ زیاد بکەنو بزانن کە ئەم ئەنجامە بەرهەمی ڕەفتاری خۆیانە، بەڵام لە بەرگێکی ناڕاستەوخۆدا ڕووبەڕوویان بۆتەوە! من بانگەشە بۆ ئەوە ناکەم، کە مرۆڤ لە ژێر گوشاردا ڕەفتار بکات. نەخێر، بەڵکو دەمەوێ ڕەفتارەکانمان بەهێمنی ئەنجام بدەین؛ بۆئەوەی لە ئەنجامدا تووشی ترسو گوشار نەبینەوە. لە عەقڵو دەروونی ئێمەدا، خشتەیەکی جیاواز داڕێژراوە؛ بەجۆرێك کە نە من دەتوانم خشتەی ناوەوەی خۆم زاڵ بکەم بەسەر تۆداو بڵێم من لە تۆ باڵاترم "نە تۆش دەتوانی بڵێی هەرچەندە تەواوی ئەم بوونەوەرە بگۆڕێ، ئەوا خشتەی دەروونی من هەمیشە بەجێگیری دەمێنێتەوە. هەموومان خاوەنی ناخێکی ناوازەینو بۆ پێناسەکردنی ئۆرگانیزمەکانی دەرەوەمان، کۆمەڵێك بۆچوونو گومانمان هەیە، هەر لەم ڕوانگەیەشەوە پاساو بۆ گوفتاری هەڵەشەیی دەروونیو فیکریی خۆمان دەهێنینەوە. تا ئەو کاتەی کە پێکدادانە دەروونیو فیکرییەکانمان، ئاڕاستەیەکی دیاریکراو وەرنەگرێت، ناتوانین بڵێین کە ئێمەش بەشێکین لە ئۆرگانەکانی دیکەی ئەم بوونەوەرە. گومان لێدەرکردنی خراپەیە لە چاکەو جیاکردنەوەی پیسە لە پاكو کەمەندکێشکردنی تیشكو ڕووناکی یەقینە بەرەو نوێبوونەوەو خاوێنکردنەوەی هۆشو مەبەست. کاتێك کەسی گومانکەر، ناتوانێ بۆچوونەکانی تەسلیم بە فلتەری قەدەر بکات، ئەو کاتە بە ناچاری گومان لە هەموو شتێك دەکاتو تەنانەت ناسراوترین حاڵەت لەلای ئەو، وەکو مەرگێکی ناوەخت وایە. ئێمە دەبێت پێوەری عەقڵیمان بە زەنگی ڕووداوەکان توند بکەینەوە؛ چونکە بەڕاستی ئەگەر لەناو گرفتەکانی ژیانەوە، لەوپەڕی ئازارەوە سەر دەرنەهێنین، ئەوا بێگومان گشت تاڵییەکانی ژیان بەسەرماندا زاڵ دەبنو زاڵبوونی ئێمەش لە ڕێگای گرتنەبەری شێوازی زبر "هیچ ئەنجامێکی لۆژیکی بەدەستەوە نادات" جگە لە پڕکردنو داڕووخانی زیاتری ناوەوەمانو دواتر فوغانو گریانو پەشیمانی بێسوود.

# وەڵامی بەجێ

* لـە ئەسـكەندەری (مەقدۆنی)یان پرسـی: بۆچی زیاتـر لە باوكت، ڕێزی مامۆسـتاكەت دەگریت؟
ئەسكەندەر لە وەڵامدا گوتی: چونكە باوكم هۆكاری هێنانەبوونمە بۆ دونیایەكی كاتیو فانیی..
بەڵام مامۆستاكەم هۆكاری خۆشبەختیمە بۆ دونیایەكی هەتاهەتایی.

* لە كابرایەكیان پرسی: بۆچی وا كەم سەردانی دایكو باوكت دەكەیت؟
گوتی: ئیشو كارم زۆرەو گرفتارم.
گوتیان: لەوانەیە لە بەرئەوە گرفتار بیت، كە سەردانیان ناكەیت!

* لە دوو هاوسـەری بەساڵاچوویان پرسـی: ئێوە چۆن توانیوتانە، شەست ساڵ پێكەوە دوور لە كێشەو گیروگرفتو ناكۆكی، ژیانی هاوسەریی بگوزەرێنن؟
لە وەڵامدا گوتیان: ئێمە كەسـانێكین، كاتێك شـتێك خراپ دەبێت، بیر لە چاككردنی دەكەینەوە، نەك گۆڕینی!

* هاوڕێیەكـم دەیویسـت لە هاوسـەرەكەی جیاببێتەوە، پێم گوت: بۆچـی دەتەوێت لە هاوسەرەكەت جیاببیتەوە؟ ئایا عەیبێكی هەیە؟
لە وەڵامدا گوتی: پیاو چۆن باسـی عەیبو عاری هاوسـەری خۆی دەكات! پاش ماوەیەك لێی جیابووەوەو ئافرەتەكە شووی كردەوە.. ئەو كات لێم پرسییەوە: ئێستا پێم بڵێ: بۆچی لە هاوسەرەكەت جیابوویتەوە؟
لە وەڵامدا گوتی: پیاو چۆن لە پاشەملە باسی ژنی خەڵكی دەكات!

* هاوڕێیەكم خۆزگەی خواستو گوتی: خۆزگە هەر بە منداڵی دەمواینەوەو گەورە نەبوووینایە!
پرسیم: بۆچی خۆزگە بۆ منداڵی دەخوازیت؟
لە وەڵامدا وتی: تا لە جێی دڵمان، سەرئەژنۆمان بریندار بووایە!





# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان

ئەو مێرووڵەیەی دەجووڵێت، وزەو توانایەکی زێتر بەکار دەهێنێت لە گایەکی خەواڵوو. (لاوتسۆ) فەیلەسوف

ژیان، پاشماوەی کەشتییەکی شکاوە، بەڵام پێویستە ئەوەمان بیرنەچێت، لە بەلەمی ڕزگاربووندا گۆرانی بڵێین.
(فرانسۆ ڤۆڵتێر) فەیلەسوفو نووسەر

ئازارو ژان کاتییە، لەوانەیە خولەکێك، یان کاتژمێرێك، یان ڕۆژێك، یان ساڵێك بەردەوام بێت!
بەڵام لە کۆتاییدا دەڕەوێتەوەو شتێکی دی جێگای دەگرێتەوە!
بەڵام ئەگەر تەسلیمی بووی، ئەوا بۆ هەمیشە بەردەوام دەبێت.
(لارنس أرمسترۆگ)
شارەزایی پاسکیل سواری

کاتێك، نارەحەتییەکانت دەگەنە ئەوپەڕی سنوور، تەنها ئەوەی لەسەرتە ئەوەیە کە پێیەکت بخەیتە پێش پێیەکەی دیت، تەنها هەنگاوی دواتر بنێ، ئەمە ئەوپەڕی کاری بەسوودە کە دەیکەیت!
(سامۆئیل فولەر) سینەماکار

ئەگەر ئاسمان دابەزێ بۆسەر سەرمان، ئەوسا ڕاوکردنی باڵندەکان ئاسان دەبێت!
(فرانسۆ بیلێ) نووسەر



# سەرکەوتن

نووریا عەلی

سەرکەوتن لە ژیانداو گەیشتن بەئامانجەکان، خولیای هەمیشەیی مرۆڤەکان بووەو مرۆڤ بەردەوام تواناکانی بەکارهێناوە لەپێناو چێژوەرگرتن لە ژیانو گەشەدان بە هەموو بوارەکانو ئاوەدانکردنەوەی ژیان، بەشێوازێك شیاوی کەرامەتو پلەوپایەی مرۆڤ بێت.

**کەواتە: یەکەمو گرنگترین بنەمای بەردەوامبوون لە ژیان بریتییە لە: هەوڵدان، کۆتاو خۆشترینو بەتاسەترین بنەماش، لە بەردەوامبوون لە ژیان بریتییە لە: سەرکەوتن!**

ئێمە هەر لەسەرەتای لەدایکبوونمانەوە لە کێبڕکێداین بۆ سەرکەوتن بەسەر کۆسپەکانی دەوروبەرماندا، ئەو کاتەی منداڵیین هەوڵدەدەین فێری قسەکردنو ڕێکردن، یان چۆنییەتی کەوچك گرتن ببین، لە کۆتایشدا بە تێپەڕبوونی کات بەسەر هەموو ئەم کۆسپانەدا سەردەکەوینو فێری قسەکردن دەبینو ڕێدەکەین ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە بە هەوڵدان توانیمان سەربکەوین بەسەر سەرجەم کێشەکانماندا......

سەرکەوتن پێویستی بە دوو پێداویستیی زۆر گرنگ هەیە کە لە هەموو کاتێکدا، بۆ سەرکەوتن پێویستمان دەبێت ئەوانیش: (کاتو متمانە)ن.

لەوانەیە گۆڤاری بڕیارت خوێندبێتەوە، چەندان چیرۆکی سەرکەوتنی تێدایە، کە هیچیان بەڕۆژێكو دوو ڕۆژ نەهاتوونە دی، بەڵکو کاتی زۆری پێویست بووە بۆ گەیشتن بە مەبەستو سەرکەوتن، کە هەموویان بە تێپەڕبوونی کاتو هەنگاو بەهەنگاو گەیشتوون بەو مەبەستو ئامانجانەی کە ویستوویانەو هەوڵیان بۆ داوە..

ئەگەر ئێمە متمانەمان بەخۆمان هەبوو، ئەوا هەموو توانا شاراوەو لەکارخراوەکان نوێو کارا دەبنەوەو ئاراستەی گۆڕانکارییەکانی ژیان دەبن. کاتێك کە سەیری کەسانێك دەکەین، زۆر لە ئێمە پلە بەرزترن، وا بیر دەکەینەوە کە قەت ناتوانین پێشبڕکێ لەگەڵ ئەواندا بکەین، ئەوان مەزنن... وان.. وا دەکەن.. کێشەکە لێرەدایە، لەم کاتانەدا شتێك هەیە کە دەبێت هەموو کات لە مێشکی خۆماندا دای بنێین، ئەویش ئەوەیە: (ئەگەر ئەوان بتوانن، منیش دەتوانم!

(if they can do it I can do It,too).

متمانە کێشەکە چارەسەر دەکات، هەڵەکە لە خۆمانەوەیە کە وا خۆمان دەردەخەین کە ناتوانین! بەڵام شێوازی بیرکردنەوەکەمان هەڵەیە! بۆیە بڕیار بدە شێوازی بیرکردنەوەت بگۆڕە بۆ گەیشتن بە وەڵامی ڕاستەقینەو بە دوای هۆکارەکاندا بگەڕێ، کەوات لێدەکات بگەیت بە کۆتا پلیکانەی سەرکەوتن، ئێمە ئەگەر پێداویستیی سەرەکی کە متمانەیە بۆ سەرکەوتن بەکار بهێنین، زۆر ئاسان کۆسپەکان دەشکێنینو ئامانجو هیواکان دەستەبەر دەکەین..

**بۆ سەرکەوتن لەهەر کارێکدا ئاماژە بە چوار هۆکاری سەرەکی دەکەین:**

**١- پشت بەستن بەخودا:** یەکێکە لەخاڵە هەرە سەرەکییەکانی سەرکەوتن؛ چونکە بۆ سەرکەوتن مرۆڤ پێویستی بەهێز هەیە، سەرچاوەی هەموو هێزەکانیش لە خوداوەیە، کەواتە: پشت بەستن بە خودا، دابینکردنی گەورەترین پاڵپشتییە بۆ سەرکەوتن ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ الطلاق: ٣

**٢- پاڵنەرە ناوەکییەکانی مرۆڤ:** کاتێك مرۆڤ هەستی کرد کۆمەڵێك پێداویستی گرنگی لە ژیاندا هەیەو بوونو گەشەو کەسایەتیو ئایندەی بەو پێداویستیانەوە بەستراوەتەوە، هێزە پاڵنەرەکانی ناوەکی مرۆڤ دەورووژێنو مرۆڤ ئاڕاستە دەکەن بەرەو دەستەبەرکردنی ئەو داخوازیانە، وەکو پێداویستی ئابووری پاڵنەری گەڕان بەدوای بژێوی دا، پێداویستی زانستی پاڵنەری گەڕان بەدوای کۆکردنەوەی زانستو زانیاری... هتد.

**٣- لێهاتووی:** واتە: مرۆڤ توانای لێهاتوویيو ڕاهاتنی زۆری تێدایە، کاتێك دەچێتە ناوجەرگەی کارەکانەوە لێهاتووییەکانی گەشەی زۆر بە خۆیانەوە دەبینو هەنگاوەکانی بەرەو سەرکەوتن ڕۆژ بە ڕۆژ نزیك دەبنەوە.

**٤- خەونی ئامانجەکانو نەخشەڕێژی:** مرۆڤ دەبێ لە ژیانیدا ئامانجی باڵا بۆ خۆی دیاری بکاتو لە ڕێگەی نەخشەیەکی کردەیی بەرەو گەیشتن بە ئامانجەکانی هەنگاوبنێت، ئەو کات سەرکەوتنی مسۆگەر دەکات.

"ئێمە لە هەڵەکانمانەوە فێر دەبین، نەك لە سەرکەوتنەکانمانەوە"

"براوە ئەو کەسەیە کە خەون دەبینێتو قەت کۆڵ نادات "

"ژیان هەلێکی ترت پێ دەدات، ئەویش پێی دەوترێ "سبەی"

"کۆڵ مەدە، سەرەتا هەمووکات قورسترینە"

"خەونی زۆر ببینە، بەڵام هەرگیز مەخەوە!"

"لە ژیاندا وا بژی کە ئەگەر مردی، هەرچی ناوت بزانێت بۆت بگری!"



# هێڵی سوور

ئازاد محێدین

با ڕەنگی سوور
گوزارشتو وێنا بکا
ڕەنگی خوێنی دڵو یەهەر
وێنای هەڵوێستو تێبینی
وێنای ئەرکو بەرپرسیاری
وێنای تێڕامانو ئۆقرە
وێنای ویژدانو موحیببەت
وێنای وەفاو ئەمەگداری
وێنای عیشقو توانەوە
وێنای کار بە زانستکردن
وێنای هیواو ئارامگرتن
وێنای بڕیارو گەشبینی
وێنای هەنگاوی شەوڕەوی
وێنای لێبڕانو نەسرەوتن
وێنای قەناعەتو تێربوون
وێنای هەستانەوە لە پاش کەوتن
وێنای تۆڵە دوای لێبووردن
وێنای خەندە لە پاش گریان
وێنای ئەستۆپاکیو ئۆباڵ
وێنای لەدایکبوونەوە
وێنای هێمای خۆنەویستی
وێنای ویستی چاکەو چاکبوون
وێنای کەرامەتو جەوهەر
با ڕەنگەکان گشت بوەستن
مەرەکەبی ڕەنگ سوورم دەوێ!

قەڵەمی خەت سوورم دەوێ!
تا بنووسم
بەخەتی سوور
ڕۆحی برسیم
بەسەر لووتکەی یەقینەوە
خواردنو پێخۆری دەوێ!
تا بنووسم
حەزم لە هیچ کەسێك نییە
هەموو کەسێکم خۆش دەوێ
چاوت بۆ سێبەر نەڕوانێ
لە سێبەرەوە بڕوانە!
هەموو شتێکم خۆش دەوێ
چوار وەرزی ساڵ
ڕووناکی خۆر، تاریکی شەو
سەرماو گەرما، تەرزەو ئاگر
ناڵەونرکەو چەخماخەی هەور
ئاوو شەپۆل، خاكو هەوا
دڕكو پەیكوڵ
پووشو چیلکە
زەردەواڵەو مۆرانەو مێش
کرمو شەوگەڕ
دووپشكو مار
شەمشەمەکوێرەو بایەقووش
گورگو کەمتیار
ڕێویو چەقەڵ

تیمساحو قرش
بوونەوەرو تێکڕای گەردوون
تەواوی بوون
لە داهاتوو چی دێتە بوون
بە بڕیاری (کن فیکون)
ئەوانەشم گشت خۆش دەوێ
بوونو نەبوون
ئەمانەو گشت
کار بە کارنامەیان دەکەن
بە پێی یاساو ڕێسا دەڕۆن
خۆشەویستن خۆشم دەوێن
با بنووسم
بە ڕەنگی خوێن
بە خەتی سوور
ئەوە مرۆڤە، تەنها مرۆڤە
لە بەرنامەو لە کارنامەی
خوا پێداوی خۆی ڕا دەکا!
مافو ئازادییەکانی خۆیو
کەسانی تر پێشێل دەکا!
سنووربەزاندن
سەر لە خۆو خەڵکی شێواندن
خەتی سوورە، هێڵی سوورە
مەودای نێوانی
مرۆڤبوون، تا یاخیبوون
زۆر نزیکو گەلێك دوورە!!



# ئەو شتانەی بەلاتەوە گرنگن
# کۆیان بکەرەوە

و: چیمەن لەتیف

لە ژیاندا زۆر پێویستمان بـە زرنگیو زیرەکییە، تا بتوانین جیاوازی لە نێوان باشترو باشتریندا بکەین، بەوردی جیاوازی لە نێـوان چاکەو خراپەدا، خراپو خراپتردا بکەین؛چونکە زۆرجار ئێمە لە جیاوازی نێوان باشـترو باشـتریندا، خراپەو خراپتردا فریودەخۆین، مەشخەڵی ڕێگاکان لەبەرچاومان تێکەڵ دەبن. ئەو دابەشکردنو داوانەی دەبن بەرێگر لەبەردەم بەدیهێنانی خەونو ئاواتەکانـدا زۆرن، دابەشـکردن یەکێکـە لەو داوانـەی کە وات لێدەکات کۆشـش بکەیت لەپێناو باشـترو چاککردنی کارەکەتدا، بەڵام ئەم کارە لە تەرازووی گرنگی پێدانەکانت شایانی ئەو کاتە نییە، کە لەو کارەدا خەرجت کردووە.

کەسـێك بە نموونە وەربگرە، ئەو زیاد لە پێویسـت گرنگی بـە لایەنـی کۆمەڵایەتـی دەدات، کاتێکـی زۆری بـۆ تەرخـان دەکات، لە دانیشـتنێکەوە دەچێت بۆ یەکێکـی تر، پەلەیەتی لە کۆبوونەوەیەکەوە بۆ گردبوونەوەیەکی تر، پرسـیاری لێدەکەیت: ئایا ئاواتی ڕامیاریت هەیە، یان بەشـداریی بانگەشەی هەڵبژاردن دەکەیـت، لـە وەڵامـدا دەڵێـت: نەخێر، بـەڵام لـەم کارە چێژ وەردەگـرم! بێگومان پەیوەندیـی کۆمەڵایەتی گرنگە، بەڵام نەك لەسەر حسـابی ئامانجەکانت، هیواو خۆزگەکانت. ئەم نموونەیە بکە بەپێوەرێکو بنواڕە.....

ئەوەی لێرەدا ڕام دەوەسـتێنێت، چیرۆکی ئەو پیاوە خاسـە دڵنەوازەیـە، کـە هۆکاری کارەسـاتێك بوو، کەسـانێکی زۆر لەو نێوەندەدا گیانیان سـپارد، هەروەها زیانێکی زۆری مادی بەدوای ئـەو کارەسـاتەدا هات، کە ئەو بەرپرسـیاربوو لـە ڕوودانی. لە کۆتاییدا دوارۆژو ناوبانگیشی خستەسەر، دەزانی بۆ؟ چونکە ئەو کارەی گرنگ بوو، جێگای بایەخی ئەو نەبوو.

ئەوەی لەبارەی ئەو زەلامەوە زانراوە، کەسـێکی دڵنەوازبوو، مەردمی خۆش گەرەك بوو، هێندە لەشارەکەی دوور نەدەکەوتەوە، بەپەرداخێك ڕۆن، یـان زیاتر کۆمەکی بەهەر کەس دەکرد، گەر پێویستی بە ڕۆن بوایە.

ئـەو خانمە لە لادێکەی تەنیشـتیانەوە هاتـووە، بە کەمێك ڕۆن دەسـتگیرۆیی دەکات، ئەو ئادەمیزادە برێك ڕۆنی پێویستە؛ بۆئەوەی دوو چەرخەکەی پێ چەوور بکات!

چون گشت داواکارییەکان مەعقولو مرۆیانە بوون، بەخاتری ئەوە مامەی پاسەوان دەسـتی بەڕووی کەسەوە نەدەنا، بەڵام کاتێك مانگ لە کۆتا نزیك بووەوە، تەماشـای کرد ڕۆن لە کۆگاکەیدا لەکەمایەتی داوە، هـاکا تەواوبوو، لەنـاکاو چراکان خامۆش بـوون، تاریکی باڵی بەسـەر ناوچەکەدا کێشا، لەو شـەوەدا پاپۆڕێکی زۆر ژێر ئاوکەوتن، مەردمێکـی زۆر تێدا چوون، دواتر لە کاتـی لێکۆڵینەوەدا دەرکەوت مامـەی پاسـەوان، ئـەوەی گرنگ بـووە جەختی نەکردۆتە سـەر، پەشـیمانی دەربـڕی بەرانبەر ئەوەی ڕووی دابـوو، زۆر هەوڵی دەدا سـۆزی بەرپرسان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، نییەتپاکی خۆی پیشانیان بدات، بەڵام هەموو کات ئەو قسانە لە گوێچکەیدا دەزرینگایەوە: ئێمە بۆ ئەوە ڕۆنمان پێ دایت؛ بۆئەوەی چراکان ڕۆشن بن.

ئـەم هەڵوێسـتە ئەوەمـان فێـر دەکات، کاری بـاش بـەو شـێوەیە نییە، ئەگەر ئێمە باشـترمان واز لێهێنا، زۆرجار ڕێگای دۆزەخ بەمەبەسـت (نیەت) جـوان پێچراوەتەوە، ئـەم ڕووداوە دەمگەڕێنێتەوە بۆ زەمانی ئەوسـا، بۆلای پێشەوا (مالیکی کوڕی ئەنەس)، ئەو بلیمەتە خودا لێی خۆشبێت. پێشەوا کوڕی وەهەب، یەکێکە لە گەورە پێشـەوایان، ڕۆژێك لە کۆڕی پێشـەوا مالیکدا بـوو خودا لێیخۆشـبێت، کـوڕی وەهەب ئەو پەڕانەی لەسـەری دەنووسـی دانینا، هەڵسـا دوو ڕکات نوێژی کرد، کاتێك گەڕایەوە پێشەوا مالیك پرسیاری لێکرد؟ لە وەڵامدا وتی: دوو ڕکات نوێژی سوننەت (زیادە) بوو کردم.

لێـرەدا پێشـەوا مالیـك وەڵامێکـی دایەوە کە لـە قووڵایی بەڕێوەبردنـی ئەولەویاتەکانی ژیانەوە هەڵدەقوڵا، پێشـەوا وتی: سـوێند بەخودا ئـەوەی جێبەجێت کرد گرنگتـر نەبوو لەوەی لەسەری بوویت!

واتـە: هەوڵدان بۆ بەدەسـتهێنانی زانسـتو خوێندنەوە، لە نوێـژی سـوننەت گرنگترە؛ چونکـە بەفێرۆدانـی کاژێرێك لە بەدەستخسـتنی زانست قەرەبوو ناکرێتەوە، بەڵام جێبەجێکردنی نوێژی سوننەت گشت کاتێك دەکرێت.

ئـەوەی لێرەدا دەبینرێتو هەسـتی پێ دەکرێـت، پێداگری پێشـەوا مالیکە لەوەی قوتابییەکەی زۆرترو بەباشـترین شـێوە سوودمەند بێت لە زانست، ئەگەر لەسەر حسابی نوێژێك بێت کە ئەمرۆ بۆخودای دەکات!

هاوڕێ، ئەوەی لێرەدا گەورەت دەکات ئەوەیە: کە ئامانجەکەت ئامادەبێت، هەمیشە لەهزرتدا بێت، لەبەرچاوت بێت، لە ناخو لە ویژدانتـدا جێگیری بکە، مەهێڵە چرکەیـەك لەبەر دیدەت بزر بێت؛ بۆئەوەی لێتەوە دوور نەبێت.

دەمەوێت گشـت کارێـك، هەمـوو ئەرکێك کـە جێبەجێت کـردووە، گشـت ئامانجێکی گـەورە کە بـاوەڕت پێیەتی، ئەوەی لەگەڵیدا ڕۆیشـتوویو تەواوت کـردووە، یان ئەوەی ڕات گرتووە، بیخەرە بەرچاو.

**پوختـە:** کارەکان پێوانە مەکە بەوەی گرنگە، یان نا... بەڵکو بەگوێرەی گرنگترینیان پێوانەی بکە، لەوانەیە کارێکی گرنگ دوا بخرێت؛ بۆئەوەی کارێکی لەو گرنگتر تەواو بکرێت.

سایە سەرگەتی

# تۆ بتەوێت، دەتوانیت!

هەبوونی ئامانج، باوەڕبەخۆبوونو متمانە، ئەو چەکانەن کە دەبــن بەهۆی بەدیهێنانی خەونەکانت. ئەو خەونانەی هەمیشــە خەونیــان پێــوە دەبینیت، لەبەر ئەوان ئــارەزووی تەمەندرێژی دەکەیــت. ئەگــەر متمانەت بەخۆت هەبوو، ئــەو خەونانە بەدی دەهێنیــت کە بە بیــری هیچ کەس لە بنەماڵەکەت، شــارەکەت، یان تەنانەت بەبیری جیهانیشــدا نەهاتووە. هەرگیز ئامۆژگاریت ناکــەم، کە پلانــت هەبێت بۆ ئامانجە مەزنەکــەت؛ چونکە زۆر ماندوو دەبیت، هێندە بەســە، کە پلانت بۆ ئەمڕۆ هەبێت. بەڵام لەبری پلان، دەبێت ویستت هەبێت، ویستی گۆڕانکاری، جیاوازیو بەرەوپێشــچوون لەســەرجەم بوارەکانی ژیاندا. ئەگەر پزیشکیت، ویســتت هەبێت، دەتوانیت چارەســەری ئایدز بدۆزیتەوە، ئەگەر شــوانیت، ویســتت هەبێت، دەتوانیت شــیری هەموو وڵات دابین بکەیت، ئەگەر مامۆســتایت؟ ویستت هەبێت، دەتوانیت هەمووان بنیاد بنێیت. ئەگەر هەرشتێکیت لەم جیهانەدا، ئەوا تۆ دەتوانیت باشــترین بیت، بــەڵام تەنها بتەوێــت، تکایە ویســتی داهێنانو جیاوازیــت هەبێــت، تــا ســەرکەوتن بێتە خزمەتــتو بیکەیتە قوربانی. سەیرکە هاوڕێ، خودا کە زاناترینە، لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ رعد ١١

واتە: (بێگومان خــودا بارودۆخی هیچ قەومو گەلێك ناگۆڕێت، هەتا ئــەوان ئەوەی بەخۆیان دەکرێت، نەیگــۆڕنو نەیکەن)رعد.١١،

خوداش دەیەوێت ویســتت هەبێت، دەیەوێت ئەوەیی پێت دەکرێت، بیکەیت، تۆ کێشــەت چییە؟ مەترســە. بەردەوام بــە. بزانە ئەگەر هەرمێی سەرســووچەکە، ویســتی ژیانەوەی نەبووایــە، بەدرێژایی زســتان بە تەنها ڕانەدەوەســتا، ئەگەر پەڕەسێلکەکانی ماڵی خۆمان ماندوبوونایە، کۆچیان نەدەکرد بۆ ژیانێکی باشــتر، ئەگەر سمۆرەی نــاو باخەکەی مامم بــەردەوام نەبووایە، هەرگیز دارەکەیی بۆ کون نەدەکرا، ئەگەر ڕۆژ نەیوویستایە، شەو هەرگیز پاشەکشەی نەدەکرد. ئەوان ویســتیان، تۆش بتەوێت، خەونەکانت بێنیتە دی، بیرکەرەوە تۆ خەونێکت هەیە، من دڵنیام، ئەو خەونە بڵێ، کە لە وتنی شەرم دەکەیــت. خەونەکەت بڵــێو بەردەوام بە، ئەم جارەش هەســتەوە، دەزانم باشترنیت لەجاران، تۆ هەر ئەو کەسەی کە لە هیچ شتێکدا یەکــەم نیت، ئەو کەســەی کــە هیچ کەس متمانــەت پێناکات، یان لەوانەیە ئەو کەســەبیت کە هەمووان چاوەڕێی شاکارن لە تۆ، بەڵام هەست دەکەیت کە هیچ نیت، دوودڵ مەبە، بڕوا بکە بەهێزتری لە جاران، ئەوە نییە بیردەکەیتەوەو هەست بەشکست دەکەیت، کەواتە: جیهان پێویســتی پێتە، نەکەیــت ماندووبیت، ئەگــەر پەیامبەری ئازیزمان (ﷺ) ماندوو بوایە، هیچ کات پەیامە مەزنەکەی بە ئێمە نەدەگەیشــت. لەوانەیە سەرەتا زۆر شکست بهێنیت، بەڵام بەردەوام بــە، چێژ لــە کاتی هەوڵدان بــۆ خەونەکەت وەربگــرە، باوەڕ بکە **مریشکی ڕەسەن، کۆتایی پاییز جوجکەکانی دەژمێرێت.**



شناویا محمد احمد

# شانشینی پاشا لاوەکە

چیرۆکێکی پەندئامێزە، باس لە شانشینێك دەكات كە لەلایەن فەرمانڕەوایەكی داناوە بەڕێوە دەچێتو ژیانێكی خۆشو ئاسوودە بەسەر دەبەن، بەڵام بەهۆی سادەیی فەرمانڕەواكەیەوە، دەسەڵات دەداتە دەست لاوێكی خۆپەرست، كە هەموو كات بڕیارەكانی دەداتە دەست بیركردنەوە هەڵەشەكانیو كەسێكی بێئەزموونەو ئامادە نییە گوێ لە ڕاوبۆچوونی كەس بگرێت جگە لە خۆی، هەموو كات خۆی بڕیاردەری یەكەمو كۆتایەو چۆنی ویستو چۆن ئارەزووی كرد، وتەكانی بەو ئاڕاستەیەدا دەكاتە فەرمان، بەڵام قبوڵكردنی ئەم هەموو تاوانەش لەلایەن كۆمەڵەكانی ترەوە سنووردارەو لە كۆتاییدا هەمووان یەك دەگرن بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی زۆردارانەی پاشا لاوەكەو دووبارە ئاسوودەیی دەگەڕێننەوە بۆ شانشینەكەیان.

لە دنیایەكی تەواو جیاوازدا، دانیشتووانەكەی ژیانێكی سادەو ساكار دەژیانو هەمووان كاروبارەكانیان پێكەوە ئەنجام دەداو لە كاتی خۆشییەكانیشدا پێكەوە بەشدار بوون، هەموویان بەپێی یاسا دەجووڵانەوەو ڕێزو خۆشەویستییەكی زۆر لە نێوانیاندا هەبوو، ئەم كۆمەڵەیە بە تەواوی جیاواز بوون لە سەرجەم شارەكانی دی، هەمووان ئیرەییان بە ڕێكوپێكیو ئەو خۆشەویستییە زۆرە دەبرد كە لە نێوانیاندا هەبوو، تەنانەت بە گەلە خۆشبەختەكە ناو دەبران، خۆشبەختی ئەم كۆمەڵە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پادشا بە تەمەنەی كە فەرمانڕەوایی شانشینەكەی دەكرد، ئەو پیرە پیاوێكی بە تەمەنو ژیرو دانا بوو، كە هەرگیز ڕێگەی بە پەرتو بڵاوبوونەوەی شانشینەكەی نەدەداو زۆرجار قوربانی داوە بۆ هێشتنەوەی ئارامگریو خەندەی سەر لێوانی گەلەكەی، ئەگەر كەسێك نەیتوانیبا بۆ ساتێكی كەم پێداویستییەكانی ژیانی دابین بكات، ئەوا هەر خێراو بە فەرمانی فەرمانڕەوای دانا لەلایەن هەمووانەوە هاوكاری دەكراو دووبارە خۆشحاڵیو خەندەو پێكەنین شەوانی شانشینەكەی دەڕازاندەوە...

یەكێك لە كارەكانی فەرمانڕەوایی بەتەمەن، دروستكردنی دیوارێكی زۆر پتەوو تۆكمە بوو كە بەدەوری شانشینەكەیاندا دروستی كردبوو، بە مەبەستی خۆپاراستن لە تێكەڵبوونی زیندەوەرەكانی تر، بێگومان هەندێك لە لاوەكان ئەم كارەیان پێباش نەبوو، باپیرەیان بە كەسێكی دوورە پەرێزو كۆنەپەرست ناودەبرد، كە نایەوێت تێكەڵ بە جیهانی دەرەوە ببن، لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر كەسێك لە دەرەوەی شانشینەكەیان پێویستی بەیارمەتی هەبێت ڕێگەی پێدەدرا كە بێتە لای فەرمانڕەواو لە كۆتایشدا چارەسەریان بۆ هەموو كێشەكان دەكرد، وردە وردە تەمەنی فەرمانڕەوای پیر بەرەو هەڵكشان دەڕۆیشتو دەیویست كەسێك بهێنێتە شوێنی خۆیو دڵنیا بێت لەوەی كە لە پاش مردنی گەلەكەی بە ئاسوودەیی ژیان دەگوزەرێنن، ئەویش بەدوای كەسێكی شیاوو گونجاودا دەگەڕا بۆ ئەم كارە، بەڵام تاكە خاڵی لاوازی ئەم فەرمانڕەوا دانایە، میهرەبانی زیاد لە پێویستو باوەڕبوونی بوو بەهەموو كەسێك، ئەوەش خاڵی لاوازی هەموو پیاوە مەزنەكانە....

یەكێك لە لاوە زیرەكەكان ویستی سادەیی فەرمانڕەوا بەكار بهێنێت بۆ بەرژەوەندیی خۆیو بە شێوەیەكی لێزانانە خۆی نزیك كردەوە لە فەرمانڕەوا، بەو مەبەستەی كە بەئامانجی خۆی بگات، هەر بۆیە فەرمانڕەواش، ئەوی هەڵبژارد وەك جێگرەوەیەكو



دەسەڵاتی تەواوی دایە دەست لاوی لێزان لە قسەکردنداو نەزان لە کردەوەدا... پاش ماوەیەکو کۆچی پیرە پیاوی زانا، هەموو شانشین لە ژێر سێبەری خامۆشیدا بوو، هەمووان زۆر دڵتەنگبوون بە بەجێهێشتنی باپیرە، لاوەکە دەسەڵاتی گرتە دەستو دەستیکرد بە جێبەجێکردنی پرۆژە ترسناکەکانی، کە دەمێکە پلانی بۆ دادەنێت.. پاش ماوەیەک سەرجەم شتەکان گۆڕان، لە جێگەی خۆشیو بەختەوەری، سەختی ژیانو بێزاری تەواوی ناوچەکەی گرتەوەو چینایەتی درووست بوو لە نێوان گەلەکەیدا، پاشای نوێ شانشینی کرد بە چەند گرووپێکەوە، ئەو کەسانەی خۆی مەبەستی بوو، لە دەوروبەری خۆی هێشتنیەوەو کۆمەڵێکی تریشی دانابوو بۆ خزمەتکردنی خۆیانو کۆمەڵێکی تریشی ئازاد کردو بە تەواوی دەستی لێبەردان کە چۆن دەژینو چۆن پێداویستییەکانیان دابین دەکەن، گرنگ نییە بەلای ئەمەوە..

ماوەی (٥) ساڵ بەردەوام بوو؛ لە ژیانی شاهانەی خۆیو هەمووان لە خزمەتی پاشا لاوەکەدا دەژیان، شانشینەکەیان بەتەواوی تێکچوو بوو لە ئاوەدانییەکی جوانی ڕازاوەوە، کە هەمووان تێیدا دڵخۆش بوون، بوو بە وێرانەیەک کە دانیشتوانەکەی ڕەنگزەردو لاواز بووبوون، هەژاری ڕووی لە ناوچەکەکردو سەرجەم بەرهەمی ماندووبوونی گەلەکەی دەچووە بەردەستی فەرمانڕەوا، پاشای لاو بەو ژیانە ڕازی نەبوو کە هەیبوو، دەیویست بە تەواوی خۆی جیا بکاتەوە لە ئەوانی تر، لەبەرئەوە فەرمانی کرد کە کۆشکێکی نوێی گەورەی لە ئاڵتوون بۆ درووست بکەنو هەمووی بە شیرینی ڕووپۆش بکەن؛ چونکە لەلای ئەم لاوە نرخی شیرینی زیاترە وەك لە ئاڵتوون، بێگومان ئەم شایە هەر دەبێت وابێت! درووستکردنی کۆشکەکەش لە ئاڵتوون بۆ ئەوەیە کە نیشانی هەمووان بدات خاوەنی هەموو شتێکە! ژیان بەم شێوەیە بەردەوام بوو لەو شوێنەدا، هەتا لە کۆتاییدا هەموو دانیشتووانەکەی بێزار بوون لە هەڵسوکەوتەکانی شاو هەمووان بە دەست هەژاریو برسێتییەوە دەیانناڵاند، لەبەرئەوە تووڕەیی گەیشتە لووتکەو بڕیارییاندا کە فەرمانڕەوا لەناوبەرنو سەرەتاش لەهاندانی دوژمنەکانی پاشای لاوەوە دەست پێبکەن، ڕۆژێك هەمووان بەرەو ڕووی قەڵاکە ڕۆیشتنو دەستیان کرد بە ڕووخاندنی دیوارە لە ئاڵتوون درووستکراوەکەی شا، شا لاوەکە کە زۆر شڵەژا بوو نەیدەزانی چۆن بەرەنگاری ئەم هەموو هێزە ببێتەوە، تەنها هەڕەشەی دەکردو دەیوت: "هەمووتان باجی ئەوە دەدەن!"، بەم شێوەیە کۆشکی پاشای خۆپەرستیان ڕووخاندو سەرجەم دەستکەوتەکانیان دابەش کرد بەسەر منداڵو کەسە برسییەکانی ناو شارداو دواتر کەسێکی بە تواناو لێهاتوو کە یەکێك بوو لەو کەسانەی بەهۆی خۆپەرستی شاوە هەموو تواناکانی کوژرابوو، کردیانە فەرمانڕەواو ئەویش بڕیاری دا کە سەرجەم سەروەتو سامانی پاشا لاوەکە، بەسەر هەموو ماڵەکاندا دابەش بکرێتو ئەو بڕەی کە دەمێنێتەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی شانشینەکەو دابینکردنی کارو پیشەی گونجاو بەکاری بهێنن..

هەروەها بڕیاریاندا کە لاوە خۆپەرستەکەش وەك دانیشتوانێکی ئاسایی لەگەڵیاندا بژیو ئەمەش ببێتە سزایەك بۆ هەڵەکانی، بەڵام هێشتا چانسێکی تری هەیە بۆ ژیان بەو هیوایەی سوود لە هەڵەکانی ڕابوردووی وەربگرێت.



# لوقمانی حەکیم

لە لوقمانی (حەکیم)یان پرسی: دانا کێیە؟
وتی: ئەو کەسەی کە نیعمەتی دنیا بەسەر نیعمەتی ئاخیرەتدا هەڵنابژێرێت.
وتیان توانا کێیە؟
وتی: ئەوەی لە ڕووی ژیرییەوە بە توانا بێت.
وتیان: ناوبانگی چاکەکاریو جوامێری لە چیدایە؟
وتی: چاکەکردن لەگەڵ خەڵکیداو منەتنەکردن بەسەریاندا.
وتیان: ئەوە چییە کە هەموو کەس بە دوایدا دەگەڕێت، بەڵام کەس نایزانێتو نایناسێت؟
وتی: سەرەنجامی کارەکانمان.
وتیان: ئەو شتە چییە کە شیرینە، بەڵام سەرەنجام ئەو کەسەی کە بیچەژێت دەیکوژێت؟
وتی: ئیرەیی بردنە.
وتیان: کام بینایە کە هەرگیز خراپ نابێت؟
وتی: دادپەروەریی.
وتیان: کام تاڵییە کە لە کۆتاییدا شیرین دەبێت؟
وتی: ئارامگرتن.
وتیان: کام شیرینییە کە لە کۆتاییدا تاڵ دەبێت؟
وتی: پەلەکردن.
وتیان: کام کراس هەرگیز کۆن نابێت؟
وتی: ناوبانگی چاك!
وتیان: ئەو نەخۆشییە چییە کە خەڵك لە چارەکردنی دا داماون؟
وتی: نەزانی.

ئا: درەخشان بەهادین



# عبدالرزاق السنهوری

## ١٨٩٥ - ١٩٧١

بەرزان ئەبوبەکر

**مرۆڤە ئاساییەکان مێژوو دەخوێننەوە.. گەورەکانیش مێژوو دەنووسنەوە..**

سەنهوری، یەکێکە لە گەورەترین زاناکانی یاسای بواری شارستانی سەردەمی خۆی!

لە ساڵی ١٨٩٥، لە شاری ئەسکەندەرییە لەدایك بووە، سەردەمی منداڵی بەبێ باوکیو دوور لە ئامێزو خۆشەویستیی باوك گوزەراندووە، ئەو تەمەنی تەنها پێنج ساڵان بوو، کە باوکی ماڵاوایی هەمیشەیی لە ژیان کرد، سەرەتای فێربوونی لە کتێبەوە دەستی پێکرد، پاشان پەیوەندی کرد بە قوتابخانەی حکوومییەوە، توانی لە ساڵی ١٩١٣ بڕوانامەی ئامادەیی بە پلەی دووەم لەسەر ئاستی میسر بەدەست بهێنێت، هەروەها توانی لە ساڵی ١٩١٧ بڕوانامەی بەکالۆریۆس بە پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا شانبەشانی خوێندنەکەی، وەکو فەرمانبەر کاری کردووە بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانی.

دوای بەدەستهێنانی بەکالۆریۆس لە یاسادا، بووە بە بریکاری گشتیی شاری مەنسوورە، لە باکووری میسر، لە ماوەی کارکردنیدا بەشداری لە شۆڕشی ١٩١٩دا کرد، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز سزای بدەن؛ بە گواستنەوەی بۆ شاری ئەسیوت لە باشووری میسر، سەرەڕای سزادانی، سەرکەوتنو بەرەوپێشچوونی سەنهوری بەردەوام بوو، تا لە ساڵی ١٩٢٠ بووە بریکاری گشتی، لە هەمان ساڵیشدا گواسترایەوە بۆ کاری وانەوتنەوەی یاسایی لە خوێندنگەی دادگای شەرعی، کە یەکێکە لە گرنگترین دامەزراوەکانی خوێندنی باڵای میسر، کە پشکی هەبووە لە زیندووکردنەوەی بیرو هزری ئیسلامدا، کە لە ساڵی ١٩٠٧ درووست بووبوو، سەنهوری ڕۆڵێکی باڵاو ناوازەی هەبوو لە نوێکردنەوەو بەرەو پێشچوونی ئەو بیرو هزرەدا، وانەی بە چەندین زانای بەناوبانگ وتووەتەوە، لەوانە (شێخ محمد ئەبو زەهرە).

دواتر سەنهوری لە ساڵی ١٩٢١ گەشتی کردووە بۆ وڵاتی فەرەنسا، بۆ درێژەدان بە خوێندن لە بواری یاسادا، سەنهوری لە سەردەمی خوێندنیدا، بیرو هزری ئیسلامی بەرجەستەکردووەو دەستی کردووە بە ڕەخنەگرتن لە شارستانییەتی ڕۆژئاوا، هەروەها هێرشی کردۆتە سەر هەڵوێستی شێخ عبدالرزاق، سەبارەت بە هەڵوێستی بەرامبەر بە خەلیفەی ئیسلامیو کاریگەریی پرۆگرامە عەلمانییەکان بەسەرییەوە.

لە فەرەنسا، سەنهوری پەیامێکی چاکخوازی دانا، بەناونیشانی (مواد البرنامج) کە تێیدا دیدو بیروبۆچوونی سەبارەت بە چاکخوازی تێدا ڕوون کردبووەوە، هەروەها بڕوانامەی دکتۆرای بەدەستهێنا، بەناونیشانی (القیود التعاقدیه علی حریة العمل فی القضاء الانکلیزی).

توانی نامەیەکی دیکەی دکتۆرا سەبارەت بە فیقهی خیلافەو پێشکەوتنەکانی، بەدەست بهێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە مامۆستاکەی ئاگاداری کردبووەوە لە قورسیی بابەتەکەی، سەرەڕای ئەوەش، کە بارودۆخی ئەورووپا لە ڕووی سیاسیو هزرییەوە، دوژمنایەتیی بیرۆکەکەیان دەکرد.

سەنهوری دوای بەدەستهێنانی ئەو بڕوانامانە لە وڵاتی فەرەنسا، گەڕایەوە بۆ زێدی خۆیو بووە مامۆستای کۆلێژی یاسا لە زانکۆی قاهیرە.

سەنهوری بەشداری جەنگەکانی سیاسیو هزری کرد، کە ژیانی میسری تەنی بوو لە پێش شۆڕشدا، لە هەموو تەیارە گۆڕانخوازو چاکخوازییەکان نزیکبوو، بەبێئەوەی سەر بە هیچ ڕێکخراوو پارتێك بێت، سەرەنجامیش بووە دامەزرێنەری کۆمەڵەی لاوانی میسری،

ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٤ لە زانکۆ فەصل کرا.

پاشان لە ساڵی ١٩٣٥ لەسەر داوای حکومەتی عێراقی بانگهێشت کـرا بۆ عێراق، لە عێـراق کۆلێژی یاسـای دامەزراند، هەروەها گۆڤارێکی بەناونیشـانی (القضاء) دەرکرد، چەندین دەسـتووری شارسـتانی بۆ عێراق دانا، لەگەڵ دانانی چەندین کتێبی یاسایی بۆ خوێندکارانی عێراق.

دواتـر لە سـاڵی ١٩٣٧ لە بەغدادەوە گەڕایەوە وڵاتی میسـر، بووە ڕاگری کۆلێژی یاسـاو سـەرۆکی وەفدی میسر لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ یاسا بەرامبەر بە لاهای..

پاشـان ڕاسپێردرا بۆ دانانی پرۆژەیەکی یاسای شارستانی، بۆ وەزارەتی دادی میسرو توانی پرۆژەکە بە سەرکەوتوویی دابنێو هاوکات لە بەرامبەردا، هیچ خەڵاتو دیارییەکی قبوڵ نەکرد.

پاشـان بـۆ جاری دووەم، ناچـار کرا کە واز لـە وانەوتنەوە بهێنێـت، لەبەرئـەوە ڕووی کـردە دادگا، بـووە قـازی دادگای مەنصورە، پاشـان بووە بریکاری وەزیری داد، هاوکات ڕاوێژکاری وەزیری ڕۆشـنبیری بوو، بەڵام دواجار لەبەر هۆکاری سیاسی، لە کارەکانی دوور خرایەوە، سـاڵی ١٩٤٢ بەناچاری ڕووی کردە کاری پارێزەریی، هەرچەندە حەزی بەو کارە نەدەکرد..

پاشان بۆ جاری دووەم، لە سـاڵی ١٩٤٣ گەڕایـەوە بۆ عێراق بۆ تەواوکردنی پرۆژە یاسـای شارسـتانییەتی نوێ، بەڵام بەهۆی پێداگری حکومەتی میسر، کە لە ڕێگەی وەفدێکەوە زۆر پێداگرییان کردبوو بۆ گێڕانەوەی سەنهوری بۆ وڵاتی میسر، ناچاربوو بەغداد جێ بهێڵێتو بەرەو دیمەشـق گەشـت بکات، لەوێش دەستی کرد بەدانانی یاسـای شارسـتانی بۆ ئەو وڵاتە، بـەڵام دووبارە بەهۆی پێداگری حکومەتی میسرەوە، ناچار کرا بگەڕێتەوە وڵاتی میسر.

لەو ماوەیەی کە لە دیمەشق بوو، یەکەم کەس بوو، کە پلانی دانا بۆ درووستکردنی یەکێتی دەوڵەتانی کەنداو لە ساڵی ١٩٤٤، پێش ئەوەی جامیعەی عەرەبی درووست ببێت.. هەروەها پرۆژەیەکی دانا بۆ پەیمانگای بـاڵای توێژینەوەی عەرەبی، کە جێبەجێکردنەکەی دواخرا بۆ ساڵی ١٩٥٢، لە چوارچێوەی جامیعەی عەرەبیدا.

پاشـان لـە سـاڵی (١٩٤٥ بـۆ ١٩٤٩)، سەرپەرشـتی وەزارەتی ڕۆشـنبیری کرد، لەو ماوەیـەدا، دوو زانکۆی گەورەی دامەزراند: زانکۆی فاروق کە ئێسـتا پێی دەوترێت ئەسـکەندەرییە، لەگەڵ زانکۆی محمد علی.

لە هەمـان کاتدا، ئەندامـی کۆمەڵەی زمانـی عەرەبی بوو، لە سـاڵی ١٩٤٦، سـاڵی ١٩٤٩ دیاری کرا بۆ سـەرۆکی ئەنجوومەنی نێودەوڵەتیی میسر، لە ماوەی ژیانیدا گەورەترین گۆڕانکاری لە بواری پەرەپێدانی ڕێکخستنو بواری کارگێڕی بۆ ئەو ئەنجوومەنە داناوە، لـە مێژووی ژیانیدا، یەکەم گۆڤـاری بۆ دەرکردووە، لەو کارەی بەردەوام بووە، تا شۆڕشی یولیوی ساڵی ١٩٥٢.

- بەشـداری دانانـی دەسـتووری میسـری کـردووە، دوای هەڵوەشانەوەی دەستووری ساڵی ١٩٢٣.

-دوای ئـەوەی لیبیا سـەربەخۆیی وەرگرت گەشـتی کرد بۆ وڵاتی لیبیاو ساڵی ١٩٥٢ خۆبەخشانە دەستوورێکی شارستانی بۆ ئەو وڵاتە دانا.

- پاشان بەهۆی تێکچوونی لەگەڵ سەرۆکی ئەو کاتەی وڵاتی میسـر (جمال عبدالناصر)سـاڵی ١٩٥٤ لە کارەکـەی لابرا، ئیدی تا ئـەو کاتەی ماڵاوایی لە ژیان کـرد، بەتەواوەتی لە کارکردنو وانەوتنەوەو سەرجەم چالاکییەکانی دابڕاو خۆی بەدوورگرت، تا دواجار لە ساڵی ١٩٧١ ماڵاوایی لە ژیان کرد.

- بـەڵام لـە مـاوەی دابـڕانو دوورخسـتنەوەی، تا سـاڵی ١٩٧٠، چەندیـن پەرتووکـی گرنگی دانا، لەوانە دانانی پێشـەکی دەسـتووریو یاسـایی بۆ هەر یەك لە وڵاتانی مصرو سـوودانو لیبیاو کوەیتو ئیمارات..

- لەو ماوەیەدا، دەسـەڵاتدارانی میسر ڕێگەیان نەدەدا بۆ هیچ وڵاتێك گەشـت بکات، تەنها یەك جار لەسەر داوای میری کوەیت، لە ساڵی ١٩٦٠ گەشتی بۆ کوەیت کرد، لەو سەردانەیدا دەستوورێکی بـۆ وڵاتی کوەیـت دانا، لەگـەڵ تەواوکردنی لایەنـە بەهێزەکانی دەسـتووری یاسـایی، کە بووە هۆی ئامادەسـازی کوەیت، تا ببێتە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

- کارە یاساییو هزرییەکانی سەنهوری:

هەرچەندە بەشـێوەیەکی ورد، نەزانراوە سـەرجەم کارەکانی دکتـۆر سـەنهوری چیـن، بـەڵام بەشـێوەیەکی گشـتی کارەکانی بەمشێوەیە بووە:

* پرۆژەکانی یاسای شارستانیو دەستوورەکانی:

١- یاسـای شارستانی میسـری لەگەڵ یاداشتی ڕوونکردنەوە، هەروەها ڕاڤەکردنی (الوسیط)و (الوجیز).

٢- یاسای شارستانی عێراقیو یاداشتی ڕوونکردنەوە.

٣- یاسـای شارستانی سوری، لەگەڵ یاداشـتی ڕوونکردنەوە، لەناویدا (قواعد الإثبات الموضوعية والاجرائيه).

٤- یاسای شارستانی دەوڵەتی کوەیت لەگەڵ یاسای بازرگانیو تـاوانو لێپێچینـەوەی تـاوان، بەرزکردنەوەی سـکاڵاو یاسـای کۆمپانیاکانو یاسای گرێبەستی بەڵێندەران... هتد.

٥- یاسای شارستانی لیبی لەگەڵ یاداشتی ڕوونکردنەوە.

٦- دەستووری دەوڵەتی سوودان.

٧- دەستووری دەوڵەتی ئیمارات.

هەروەها سەنهوری ئەم کتێبانەشی نووسیوە:

١- شرح القانون المدني في العقود.

٢- (الوسیط فی القانون المدني) (١٠) بەشە.

٣- نظرية العقد في الفقه الاسلامي.

٤- مصادر الحق في الفقه الاسلامي.

٥- أصول القانون.

هەروەهـا لە بواری هزردا، چەندین دانراوی بە زمانی ئینگلیزی داناوە، کـە گرنگترینیـان ئـەو لێکۆڵینەوانـەن کـە لـە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکانـدا سـەبارەت بـە (القانون المقارن) سـەبارەت بە شەریعەتی ئیسلامی، پێشکەشی کردن، لەگەڵ چەندین دانراوی دیکە، کە لە دەرەوەی وڵاتی میسـردا بڵاوکراونەتەوەو تا ئێستاش سوودیان لێ دەبینرێت، بەتایبەت لەو ماوەیەی کە لە عێراقدا بووە، کتێبەکانی سەبارەت بە دانانی یاسای شارستانی عێراقی بڵاو کردۆتەوە.



جەلال عەبدوڵا حاجی

بەشی یەکەم

# سەرچاوەی کێشەکە کێیە..؟!

زۆرجاران دەبینین و بەرگوێمان دەکەوێت؛ بۆئەوەی چارەسەری کێشەی پیسبوونی ژینگە بکرێت، دەبێت کارگەی ڕیسایکلین دابنرێت، بیرۆکەی سەرلەنوێ بەکارهێنانەوە (ڕیسایکلین) دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی جەنگی جیهانی یەکەم، بەهۆی جەنگەوە وڵاتان دەستیان نەدەگەیشت بە مادە خاوە سەرەکییەکان، وەك لاستیك، لەبەرئەوە هەوڵیان دا، لاستیکی بەکارهاتوو کۆبکەنەوەو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، سەرلەنوێ بەکاری بهێننەوە، لە دوای چەند ساڵێك، ئەم کارە ڕێڕەوی خۆی وەرگرت، بە جۆرێك بوو بە باشترین ڕێگا، بۆ ڕزگاربوون لە خاشاکی ڕەق؛ چونکە سوودێکی ژینگەیی زۆری هەبوو.

**مەبەست لە سەرلەنوێ بەکارهێنانەوە(Recycling) چییە؟**

ڕیسایکلین بریتییە لە: کرداری سەرلەنوێ دروستکردنەوە، بە بەکارهێنانەوەی خۆڵ و خاشاکی ماڵان و کارگەکان، بۆ نموونە: دەتوانین ڕۆژنامەو کاغەزی بەکارهاتوو، بگۆڕین بۆ مقەبا، یان قوتوی کانزایی بەکارهاتووی کۆن، بگۆڕین بۆ قوتوی نوێ، یان پارچە کانزا، بگۆڕین بۆ دارشتە؛ وەك بەکارهێنانی ئاسنی بەکارهاتوو بۆ دروستکردنی شیش، مەبەستی سەرەکی لە ڕیسایکلین، کەمکردنەوەی قەبارەی خۆڵ و خاشاکە، کەڵەکەبوونی خاشاك لە ژینگەدا کەم دەکاتەوە، پاشان بە پۆلێنکردن و جیاکردنەوەی خاشاکەکە بە گوێرەی ئەو مادەیەی لێی دروست بووە، دەست دەکرێت بە کرداری دروستکردنەوە.

**بۆچی ڕیسایکلین بکەین؟**

لەم ڕێگەیەوە دەتوانرێت سوود لە خۆڵ و خاشاك وەربگیرێت، سەرچاوەیەکی باشە بۆ وەبەرهێنان و دەستکەوتنی مادەی خاوی وەك کاغەز، ئەلەمنیۆم، شووشە، پلاستیك و ئاسن ..هتد، ئەو بەشەی تری دەتوانرێت وەك سەرچاوەی وزە سەیر بکرێت، بە سووتاندنی کارەبای لێ بەرهەم بهێنرێت، لەم ڕێگەیەوە ڕزگارمان دەبێت لە گرفتی پیسبوونی هەواو ئەو مادانەشی کە دەبنە هۆی نەخۆشی، لە هەوادا کەم دەبنەوە، هەروەها پەیینی لێ بەرهەم بهێنرێت. کرداری ڕیسایکلین، وزەیەکی زۆر دەگێڕێتەوە، بە ڕیسایکلکردنەوەی قوتویەکی ئەلەمنیۆم، ٩٥٪ وزەی پێویستمان بۆ دەگێڕێتەوە کە پێویستە بۆ دروستکردنی قوتوویەك لە مادە خاوە بنەڕەتییەکەی (بۆکسایت)، ڕیسایکلینکردنەوەی کاغەز، واتە: پارێزگاریکردن لە بڕینەوەی درەختەکان و پیسبوونی ئاو، هەروەها پارێزگاری لە سەرچاوە سرووشتییەکان دەکات، دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پەستانی سەرشوێنی فڕێدانی خۆڵ و خاشاك، لە هەمووی گرنگتر، هاوڵاتیان هان دەدات بۆ بەشداریکردن لە پاراستنی ژینگەدا.

کرداری ڕیسایکلین، هەروا ئاسان نییە، دەبێت ئامادەکاری بۆ بکرێت، هۆشیاری بڵاوبکرێتەوە لەو بارەیەوە، لەگەڵ گرتنەبەری ڕێوشوێنی تایبەت بەو کارە، بۆ نموونە دەبێت سەتڵی خۆڵی تایبەت بە هەریەکە لە کاغەز، شوشە، پلاستیك و کانزا دابنرێت، ڕێنمایی بدرێت بە ماڵان، نابێت خاشاکی تەڕو وشك تێکەڵ بکەن، شوێنی تایبەت بە کۆکردنەوە باتری و گڵۆپ بکرێتەوە، هەروەها دەبێت لە هەر شارێکدا، ناوەندێك هەبێت، بۆ کۆکردنەوەی کەلوپەلی نیوماڵ و ئامێرە کارەباییەکان.

گرفتی گەورەی بەردەم کرداری ڕیسایکلین، تێکەڵکردنی هەموو جۆرە کەرەستەیەکە لەلایەن هاوڵاتیانەوە، دەبێت هەوڵ بدرێت زۆرترین بڕی خۆڵ و خاشاك، ڕیسایکل بکرێتەوە، ئەوەی جێگەی نیگەرانییە بەبەردەوامی بڕەکەی لە زیادبووندایە، لە ڕاستیدا دوو هەنگاوی گرنگتر هەیە لە پێش کرداری ڕیسایکلینەوە، ئەویش هەردوو کرداری: کەمکردنەوە (Reduce)و بەکارهێنانەوە (Reuse)یە، لە بەشی دووەمدا باسی لێوە دەکەین.

ئایا بیرت لەوەکردووەتەوە ئەگەر خۆڵ و خاشاك نەبێت، پێویستمان بە ڕیسایکلین نییە.!؟ ئەگەر خۆڵ و خاشاکی ماڵەوەمان کەم بکەینەوە بۆ نیوە، بڕی خۆڵ و خاشاکی فڕێدراوی شارەکەمان کەم دەبێتەوە بۆ نیوە..!؟ لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت؛ گرفتەکە لە زۆریی بڕی خۆڵ و خاشاکەوە دێت، ئەویش ئێمە بەرهەمی دەهێنین، (کەواتە: خۆت بە بەرپرسیار بزانە بەرامبەر بە کیسەی خۆڵ و خاشاکی ماڵەوەتان).



# ئەگاسا کریستی

ئالانی

**لە وتە بەناوبانگەکانی ئەگاسا: ئەگەر ئافرەتان ئەو پارەیەی لە کڕینی میکیاژو جوانکاریی ڕووکەشیاندا سەرفی دەکەن، هاتباو نیوەی ئەو پارەیان دابایە بە کتێب، بۆ خۆ ڕۆشنبیرکردن، ئێستا لە جیهانێکی ئارامدا، ئافرەت حوکمی دنیای دەکرد!**

ئەگەر بەرهەمە چاپکراوەکانی ئەگاسا کریستی بخەیتە سەر یەك، ئەوا شێوەی (٢٠٠٠٠) بیست هەزار گردۆلکە درووست دەکەن، کە هەر یەکێك لەو گردۆلکانە، یەکسانە بە بەرزیی تاوەری ئیڤل لە پاریس، یاخود ٣٤٠٠ لەو گردانە بە ئەندازەی بەرزیی لووتکەی ئێڤەرستە کە بەرزترین لووتکەیە لە جیهاندا، واتە: نزیکەی شەش جار هێندەی بەرزی لووتکەی ئێڤەرستە!

خاتوونە ڕۆماننووسی ئینگلیزی (فرجینا ولف) کە لە سەردەمی ئەگاسادا ژیاوە، دەڵێت: ئەگەر قسە لەسەر ژنە نووسەرەکان بکەین، پێویستمان بە کاتێکی زۆر دەبێت، لە کۆنو ئێستاشدا وەهابووە، ئاسانترین شت کە ئافرەت بتوانێت ئەنجامی بدات، ئەوەیە کە بنووسێت!!

ئەگەر بە بۆچوونی خاتوو ولف سەرژمێریکردنی ژنە ڕۆماننووسەکان قورس بێت، چی وای لێکردین کە لەناو ڕۆماننووسە ئینگلیزەکاندا تەنها ڕۆمانەکانی ئەگاسا کریستی بخوێنینەوە؟

چی وای لە ئەگاسا کریستی کرد کە زۆرترین نووسەرە بەریتانییەکان بەرهەمەکانی بخوێننەوە؟ لەدوای خاتوو ئەگاسا کریستی فەیلسوفی بەناوبانگ شکسپیر دێت بەپێی سەرژمێرییەکانی ڕێکخراوی یونسکۆ!!

چی وای لە ئەگاسا کریستی کرد کە ببێتە بەناوبانگترین نووسەر لە مێژوودا لە ڕووی بڵاوبوونەوەی کتێبەکانیو ژمارەی فرۆشتنی بەرهەمەکانییەوە؟ چی وای لە ئەگاسا کریستی کرد کە ببێتە خاوەنی بەناوبانگترین چیرۆکە پۆلیسییەکان لە تەواوی سەردەمەکانی مێژوودا؟

چی ئەگاسا کریستی جیادەکاتەوە کە ژمارەی ڕۆمانە چاپکراوەکانی دەگاتە نزیکەی دوو ملیار دانە؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، سەرەتا با بە ژیاننامەی ئەگاسا کریستی دەست پێبکەین!

ئەگاسا کریستی لە شارۆچکەی توروکوای کە ئێستا بەشێکە لە تۆرۆبی، سەر بە ناوچەی دیفون باشوری ئینگلتەرا لە ساڵی (١٨٩٠) لە باوکێکی ئەمریکیو دایکێکی ئینگلیز هاتۆتە دونیاوە، ئەگاسا کریستی تەمەنی منداڵی لە شوێنی لەدایکبوونی بە بەختەوەری بردە سەر، باوکی کەسێکی ڕووخۆشو دڵخۆشبوو، دایکیشی ئافرەتێکی زیرەكو خاوەن هیوا بوو، دایکی زۆر باوەڕی بووە بەوەی کە منداڵان دەتوانن هەموو شتێك بکەن، ئەگەر تواناکانیان بخرێتەگەڕ!

ئەگاسا کریستی هەرگیز نەڕۆیشتووە بۆ قوتابخانە، لەبەر دابو نەریتی ئەو کاتی شارۆچکەکەیان، بەڵکو لەسەر دەستی دایکی لەماڵەوە فێری خوێندەواری بووە، یەکێکی دیکە لە خاڵە بەهێزە جەوهەرییەکانی ئەگاسا کریستی، ئەوەیە بەدەست قورسی تێگەیشتنییەوە ناڵاندوویەتی لە منداڵیدا، هەروەها توانای حنجەکردنو ناسینەوەی پیتەکانی لە منداڵیدا کۆسپێکی گەورە بووە لەبەردەمیدا.

(دایك پۆڵایە، چیایە، کۆڵەکەو ڕاگری منداڵەکەیەتی، ئەو چۆنی بوێت منداڵەکەی وەها دەردەچێت!!) سەرکەوتنی ئەگاسا کریستی دەگەڕێتەوە بۆ هاندانو ماندووبوونیو بەردەوامیو کۆڵنەدانی دایکی لەگەڵیدا، دایکی هانی دا کە بنووسێت، هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە هەوڵی دا فێری بکاتو ئاراستەی بکات بۆ دونیای نووسینو داهێنان، دایکی هەر لە منداڵییەوە هانی دا کە خامەکەی بگرێتە دەستو دەست بە نووسین بکات؛ چونکە دایکە ژیرو زیرەکەکان هەر زوو هەست بە لێهاتوویيو تواناو بەهرەی منداڵەکانیان دەکەن، تەنانەت جارێکیان ئەگاسا لەسەر جێگە کەوتبوو، تووشی سەرماو کۆکەو هەڵامەت ببوو، دایکی پێی دەڵێت:

* ئەگاسا باشترە ئەم کاتەی کە لەسەر جێگە کەوتووی، بە نووووسینی چیرۆکێکی کورت بەسەریبەریت!

ئەگەسا لە وەڵامدا وتی: بەڵام وا هەست ناکەم کە بتوانم ئەو کارە بکەم! دایکی وتی: من دڵنیام کە دەتوانیت، تۆ تەنها هەوڵ بدە، پاشان ئەنجامەکەی دەبینیت! ئیدی ئەگاسا خامەکەی هەلگرتو چەند ساڵێك سەرقاڵ بوو بە نووسینەوەی چیرۆکەکانی (قابضة للصدر)، لەگەڵ چەند پارچە شیعرێك، پاشان دەستی کرد بە نووسینی یەکەم ڕۆمانی بە ناونیشانی (بەفری بیابان)، بەڵام چاپخانەکان ئەم ڕۆمانەیان ڕەتکردەوەو قبوڵیان نەکرد تەنانەت چاپی بکەن!

ئەو کات کەس بە ئەگاسا سەرسام نەبوو، ئەم ڕۆمانەشی چاپ نەکرا، ئەگاسا بە چاپ نەکردنی ڕۆمانەکەی سارد نەبووەوە، دەستی لە هەوڵدانو تێکۆشان هەڵنەگرت، بەڵکو بیرۆکەی نووسینی ڕۆمانی پۆلیسی هات بە خەیاڵدا، دواتر هەڵسا بە نووسینی ڕۆمانی (القضى الغامضه في ستايلز)، کە ئەم ڕۆمانەش شەش چاپخانە ڕەتیان کردەوە، بەڵام چاپخانەی حەوتەم ڕۆمانەکەی قبوڵ کردو هەڵسا بە چاپکردنی یەکەم ڕۆمانی خاتوو ئەگاسا، ئەم ڕۆمانە زۆر بە ئاسانی بڵاوو بووەوەو ناوبانگی پەیدا کردو خوێنەرانی بە خۆشحاڵییەوە پێشوازییان لێکرد، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی نووسینی ئەو ڕۆمانەدا ئەگاسا لە نەخۆشخانەییە سەر بە مانگی سوری نێودەوڵەتی، دوای جەنگی جیهانی یەکەم، وەکو پەرستارێکی خۆبەخش کاری دەکردو هاوکاری برینداراەکانی دەکرد، هەر لەو نەخۆشخانەیەدا کاری ئامادەکردنو ڕێکخستنی دەرمانەکانی دەکرد، هەروەها شارەزایی باشی هەبوو سەبارەت بە ژەهرو پێکهاتەکانی، ئەم کارەشی کاریگەریی زۆری هەبوو

لەسەر نووسینەکانی سەبارەت بە تاوان، ئەم ئەزموونەی شارەزاییو زانیاری لەسەر مادده ژەهراوییەکانو پێکهاتەکانیو کاریگەری لەسەر جەستە، ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی زیانگەیاندن بە جەستەی مرۆڤ، ئەمەش وایکردبوو کە خوێنەری ڕۆمانەکانی ئەگاسا زانیارییەکی باشیان چنگ دەکەوت سەبارەت بە زانستی پزیشکیو زیانەکانی ئەو دەرمانانە!

لەو ماوەیەدا کەسانێکی زۆر لە هەژارانو دەوڵەمەندان خازوێنی ئەگاسایان کرد، بەڵام لە کۆتاییداو لە ساڵی ١٩١٤هاوسەرگیری لەگەڵ فرۆکەوانێکی سەربازیدا کرد کە بە (ئەرشیبالد کریستی) بانگیان دەکرد، هەر لەو فرۆکەوانەوە نازناوی کریستی وەرگرت کە بە درێژایی ژیانی بووە پاشگری ناوەکەیو بە (ئەگاسا کریستی) ناوبانگی دەرکرد، ماوەی چواردە ساڵ پێکەوە ژیان، بەڵام دواجار لە ساڵی ١٩٢٨ پاش ماوەیەك لە کۆچی دوایی (مامۆستا تاڤانەکەی، دایکی ئەزیزی) لە هاوسەرەکەی جیابووەوە!

ئەگاسا دووساڵ دوای ئەوەی لە هاوسەری یەکەمی جیابووەوە، هاوسەرگیری لەگەڵ زانای شوێنەوارناسی بەناوبانگ (ماکس مالوان) کرد، کە ڕێگەی پێدا سەردانی زۆرێك لە دەوڵەتانی ڕۆژهەڵات بکات، لەوانە عێراقو میسرو ئوردونو سوریاو ئێران، ئەم سەردانانەی بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەك لە ڕۆمانەکانی لەسەر ئەم وڵاتانە بنووسێت، لەوانە (موت علی النیل)، (چاوپێکەوتنێك لە بەغداد، (تاوانێك لە بەغداد))لەو کاتەش کە گەشتی کرد وڵاتە پێشکەوتووەکانی ڕۆژهەڵات، یەکێك لەبەناوبانگترین ڕۆمانەکانی لەو بارەیەوە نووسی بەناونیشانی(جریمة فی قطار الشرق)..

ئەگاسا لەگەڵ هاوسەرە نوێیەکەی لە ڕووی دەروونیو هزرییەوە جێگیرو ئاسوودەو خۆشحاڵ بوو، مالوانی هاوسەری لەبارەیەوە دەڵێت: لە ماڵەکەماندا ژوورێکی بچووکمان بۆ ئەگاسا دروستکردبوو، هەر لە بەرەبەیانەوە لەو ژوورەدا دادەنیشتو ڕۆمانەکانی دەنووسییەوە، پاشان بە ئامێری چاپ ڕاستەوخۆ تایپی دەکرد، زیاتر لە شەش ڕۆمانی بەو شێوەیە نووسیوە!

تا ئەو کاتەی ئەگاسا بەشداری لە گەشتە زانستییەکانی شاندو پشکنیندا کرد، وەکو گەشتی بەریتانیا بۆ نەینەوا لە باکوری عێراق، بە سەرۆکایەتی (دکتور تومس کامبل)، هەروەها گەشتێکی دیکەی (ڤازانج ویست)ی لەگەڵ هاوسەرەکەی ئەنجامدا لە ساڵی ١٩٣٢، ئەگاسا کاتی پێویستی بۆ نووسین بەدی دەکرد، لەبەر دەنگە دەنگو ژاوەژاو، خەیمەیەکی دوور لە دەنگەدەنگی هەلکۆڵین هەڵدا؛ بۆئەوەی دەست بە نووسینی ڕۆمانو چیرۆکەکانی بکات..

چیرۆکو ڕۆمانەکانی ئەگاسا بە جوانی هۆنینەوەو پەیوەستکردنیان بە ڕووداوەکانی ڕۆژگارەوەو دارشتنێکی ناوازەوەو ڕیزبەندییەکی ژیرانە جیادەکرێتەوە، بە پشتبەستن بە زۆرێك لە ئەلغازو هۆنینەوەیەکی شاراوە، چ لە دروستکردنی چیرۆکەکان، یان لە گفتوگۆ لەگەڵ کەسایەتییەکان، تەنانەت هەڵبژاردنی شوێنی ڕووداوەکانیش، هەموو ئەمانەش بە زۆری تاموچێژی تایبەتی بە نووسینەکانی ئەگاسا بەخشیوە.

هەروەها خەیاڵی فراوان یارمەتی داوە، لە تەکنیکی چیرۆکەکانیدا پشتی بە فێڵو هەڵخەڵەتاندن لەسەر شێوەی وروژاندنو بەخشینی تەشویقو لێوان لێوە لە شارەزایی، بەشێوەیەك هەر کەس ڕۆمانەکانی بخوێنێتەوە لە کۆتاییدا بە چارەسەر دەگات، پێش ئەوەی ڕۆمانەکە تەواو بکات، دواتر لە کۆتاییدا بیرکردنەوەکانی لەگەڵ چارەسەرە ژیرییەکەی پێچەوانە دەبنەوە، بەشێوەیەك ئەم ڕستەیە باوە هاتووە سەبارەت بە خوێندنەوەی ڕۆمانەکانی ئەگاسا، کە لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا دەڵێت: (ئای لە من.. چۆن ئاگاداری ئەمە نەبووم!)

هەروەها ڕۆمانەکانی ئەگاسا بە قووڵایی ناخی مرۆڤدا ڕۆدەچن، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی گشتی ڕۆمانەکانی ئەگاسا ڕۆمانگەلێکی پوختو پاراون، هیچ شتێکی لەبارەی وروژاندنی غەریزەی مرۆڤو شەرمەزارکردنی مرۆڤەکانو شتێکی دوور لە حەیاو حورمەتی تێدا بەدی ناکرێت.

ئەگاسا لە هەموو ڕۆمانەکانیدا ئەم ڕستەیەمان بیر دەهێنێتەوە: (دڵنیابن چاکە سەردەکەوێت! تاوان سوود ناگەیەنێت)!

هەروەها خاڵێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانەکانی ئەگاسا ئەوەیە کە بە زمانێکی سادەو ساکارو زنجیرەیی نووسراون، هەر ئەمەشە هۆکاری برەودانو بەدەستهێنانی ناوبانگێکی گەورەی ڕۆمانەکانییەتی، لەناو خەڵکی بەریتانیاو ئەوروپا، هەرئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی بۆ چەندین زمان وەرگێڕدراوە.

ئەگاسا هەرگیز تموحی ئەوە نەبووە کە خەڵاتی نۆبڵ بەدەست بهێنێت لە بواری ئەدەبدا، بە پێچەوانەی نووسەرەکانی دیکەوە، کە تەنها هەوڵی داهێنانو سەرکەوتنیان بۆ ئەوە بووە، تا کاندید بکرێن بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە!

لەبەرئەوە ئەگاسا پارێزگاری لە سادەو ساکاری زمانی نووسینەکانی کردووە، تا بە ئاسانی خوێنەر لێیان تێ بگات.. چونکە هەموو خەمو هەوڵدانو حەزکردنی بریتی بووە لەوەی خوێنەر ئاڕاستە بکات بۆ خوێندنەوەو حەزکردن بە خوێندنەوە، هەرگیز گوێشی بە ڕەخنەی ڕەخنەگرانو بۆچوونەکانیان نەداوە!

**چەند ڕاستییەك سەبارەت بە ئەگاسا کریستی:**

* ئەگاسا کریستی شەستو حەوت ڕۆمانی درێژو چیرۆکەکانی تاوانی نووسیوە، دەیان کورتە چیرۆکی نووسیوە، کە لە سیانزە گرووپدا بڵاوکراونەتەوە، ژمارەی کارە پۆلیسییەکانیشی هەشت کتێبە.

* شەش ڕۆمانی بە ناوی خوازراوی (ماری ویسماکوت)ەوە نووسیوە.

* شانزە شانۆنامەی نووسیوە، بەناوبانگترینیان بەناونیشانی (تەڵەی مشك)ەوەیە، کە درێژترین شانۆیە لە مێژوودا نمایش کرابێت.. کە تائێستاش بەردەوام لە شاری لەندەن نمایش دەکرێت.

* ژیاننامەی ئەگاسا لە ڕۆمانی (تابلۆیەکی تەواونەکراو) یان (وێنەی ناتەواو) نووسراوەتەوە، بە نازناوی (ماری ویستماکوت) ساڵی ١٩٣٤، پاشان بە پێنووسی خۆی ژیاننامەی خۆی نووسیوەتەوەو ساڵی ١٩٧٧ چاپکراوە، واتە: ساڵێك دوای کۆچی دواییو ماڵاواییکردنی لە ژیان ژیاننامەو یادەوەرییەکانی چاپکراوە.

* کتێبەکانی نزیکەی دوو ملیار دانەی لێ چاپکراوە، هەروەها بۆ نزیکەی پەنجا زمان وەرگێڕدراون، بەمەش فرۆشتنی ڕۆمانە دانراوەکانی ئەگاسا لەسەرو هەموو کتێبە عەرەبییەکانەوەیە، لە سەرەتای دەوڵەتی ئەمەوییەوە، تا کۆتایی سەدەی بیست، بە دەیان جار، بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی بۆ زمانە جیهانییەکان زیاترە لە وەرگێڕانی بەرهەمە عەرەبییەکان، بۆ زمانەکانی دیکە لە سەردەمی خەلیفە مەئموونەوە، تا سەدەی بیست.

* فرۆشتنی بەرهەمەکانی لە ساڵی ٢٠٠٣ تەنها لە وڵاتی فەرەنسا گەیشتە بیست ملیۆن دانە.

* ئەگاسا لە ماوەی ژیانیدا چەندین نازناوی بەدەستهێناوە، لەوانە (سیده الروایه البولیسیه، کاتبه الجریمه الاولی، سیده الاسرار، سیده الموت....).

* ئەگاسا ژمارەیەکی پێوانەیی لە ئەوروپاو جیهاندا بەتایبەت بەریتانیا تۆمارکردووە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەگاسا لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٢٦ ماوەی ١١ ڕۆژ دیار نەما، هەزاران بەریتانی خۆیان فیدایی کرد بۆ گەڕان بەدوایدا، ملیۆنانیش بەردەوام لە ڕۆژنامەو ڕاگەیاندنەکاندا هەواڵیان دەپرسیو بەدوای چارەنووسیدا وێڵبوون.

* ئەگاسا لە لایان ئیمپراتۆرەوە پلەی خاتوونی سەرکردەی بۆ ساڵی ١٩٧١ پێبەخشرا.



# هەناسەی ئاسوودەیی

کۆسار سوبحان

ئێوارەیەکیان کە بەسەر شەقامە شکاوەکانی شاردا دەگەڕام، ئاسمان هەورێکی سپی لە ئامێز گرتبوو، باران نم نم دەبارییە سەر زەوی. زەویش بۆنێکی تایبەتی هەبوو، چۆلەکەکان جریوەیان دەهات، سەمایان دەکرد، هەندێکیان پێکەوە، هەندێکیان بە تەنها، هەستم دەکرد منیش ئاوێتەی ئەو جوانییە بووم، هەرلەبەرئەوە بیرم لە سەردەمەکانی منداڵیم دەکردەوە.

لە بیرمە کە منداڵ بووم باوکم لە کارەکەی دەگەڕایەوە، هەمیشە بەر لەوەی پشوو بدات لە ئامێزی دەگرتم، سۆزی باوکایەتی بەسەردا دەباراندم، یاریو گەمەی لەگەڵ دەکردم، بەڵام بە داخەوە ئەو سۆزو گەمەیەی باوکم درێژەی نەکێشا.

ڕۆژێکیان زووتر لە کارەکەی گەڕایەوەو دایکمی بانگکرد، پێی گوت زۆر سنگم دێشێت، ئاگات لە خۆتو ئەو منداڵانە بێت، سەیرێکی منو براکەمی کردو لە کۆشی دایکمدا چاوەکانی بۆ هەمیشە پێکەوەناو دوونیای بۆ هەمیشە بەجێهێشت، دایکم دەستی کردە گریانو هاتو هاوار، ئەو ڕۆژە بۆ منو براکەم ناخۆشترین ڕۆژ بوو، هێندە منداڵ بووم لەوە تێ نەدەگەیشتم کە تەنها باوك مردن نەستەمو ناڕەحەت نییە، بەڵکو ژیان دوای ئەو، هەموو ڕۆژێکی دەبێتە مردن.

ئێمە زۆر منداڵ بووین، دایکیشم گەنجو جوان بوو، نەماندەتوانی بژێوی ژیان پەیدا بکەین، بەڵام دایکم وەك هەر شێرە ژنێکی تری کورد، قۆڵی لێ هەڵماڵیو نانی بە پارە بۆ خەڵکی دەکرد، ئێوارەیەکیان پێش خۆرئاوابوون منو براکەم لە کۆڵان بووین، براکەم لە من گەورەتر بوو، هەموو منداڵانی کۆڵان یارییان دەکرد، خەندەو پێکەنین لەسەر لێویان بوو، تەنها منو براکەم نەبێت بە بێدەنگی سەرنجمان دەدا، کوڕێکی لاو کە ناسیاوی دراوسێیەکمان بوو، زۆر جوانو دەوڵەمەند دیار بوو، زۆر سەرنجی داین وەك ئەوەی شتێکی لە ئێمەدا بەدی کردبێت، لە ڕێگەی دراوسێکەمانەوە بارودۆخی ئێمەی زانیبوو، لەبەرئەوە هەرچەندە براکەم منداڵ بوو دەیخوێند، بەڵام ئەو بردییە لای خۆیو کاری پێدا، بەردەوام چاودێری دەکردین. منو براکەم لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام بووین لە خوێندن، ئەو بۆ تەنها جارێکیش نەدەهاتە ماڵەوە؛ چونکە دایکم گەنج بوو، ئەمەش لەبەرئەوە بوو کەس باسمان نەکات.

ئێمە گەورە بووین، خوێندنی زانکۆمان تەواو کرد، براکەم بوو بە خاوەنی ئیشوکارو باری داراییمان زۆر باش بوو.

دایکمو براکەم، دیاربوو پێکەوە قسەیانکردبوو، کە چۆن پاداشتی ئەو کەسە بدەنەوە، لەبەرئەوە منیشیان بانگکرد، پێیان گوتم: بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ (...) ناکەیت؟ ئێمە تەنها بەو شێوازە دەتوانین پاداشتی بدەینەوە، منیش سەرم داخستوو پێم گووتن: پێویستم بەبیرکردنەوە هەیە، ئەو شەوە بەردەوام بیرم دەکردەوە، نەمدەتوانی لە ژێرچاکەی ئەو گەنجەدا دەربچم، لەبەرئەوە بڕیارمدا هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم، لەگەڵ ئەوەشدا من کچێکی شۆخو شەنگ بووم، کاتێك براکەم ئەو پێشنیارەی پێ ڕاگەیاندبوو، ئەویش لە وەڵامدا گووتبوی باخۆی ببینم، کاتێك هات بۆ بینینم، زۆر بەئاسایی دەهاتە پێش چاو، بەڵام من ئەژنۆکانم دەلەرزین، ئەویش زۆر بەشێوەیەکی ئاسایی پێی گووتم: من نازانم تۆ بۆچی ئەم بڕیارەت داوە؟ بەڵام بەهەرحاڵ تۆ کچێکی گەنجو جوانیت، من تەمەنم لە تۆ زیاترە، بۆچی کارێکی لەمشێوەیە دەکەیتو وەها بڕیارێکت گرتووە؟ من دەمەوێت لە ژیانێکی باشتردا ئێوە ببینم، بەلامەوە ستەمێکی گەورەیە کە ئەو ژیانەی کە تاوەکو ئێستا بەو هەموو تاڵیو ناخۆشییەوە بۆ خۆتان دروستانکردووە، بەوەها پێشنیارێك تەمومژاوی ببێت.

کاتێك کە گوێم لەم قسانەبوو، هەستم بەبەهای مرۆڤایەتی خۆمو بەرامبەرەکانم دەکرد، هەستم دەکرد کە ئەو چەندە خاوەنی ڕەوشتی بەرزی مرۆڤ دۆستانەیە، سەیر لەوەدابوو بەهۆی ئەوەوە ئێمە گەیشتین بەم ڕۆژە، بەڵام بەلایەوە ئەستەم بوو کە بەو جیاوازی تەمەنەوە ببمە هاوسەری، هەربۆیە پێشنیارەکەی ڕەتکردەوە.

منیش هەناسەیەکی قووڵی ئاسوودەییم هەڵکێشاو گوتم: هێشتا هەن ئەو کەسانەی کە لەپێناو ئاکارە بەرزەکانی مرۆڤایەتیدا واز لە حەزو ئارەزووەکانیان دەهێنن، هیواو ئاواتیان ئەوەیە کە خۆشبەختیو بەختەوەری مرۆڤە بێ نەواکان ببینن، ئەگەرچی لەو پێناوەشدا زیانیان پێبگات.



# هاوسەرگیرییەکی هەمیشە زیندوو

موحسین اسماعیل پشدەری

پرۆسەی هاوسەرگیری یەکێکە لەو سیستەمە کۆمەڵایەتییە توندوتۆڵو بە هێزانەی، لە هەموو کۆمەڵگاکاندا هەیە، بەتایبەتیش لە کۆمەڵگای مسوڵمانان ئەو بەهێزییە دەبینرێتو کۆمەڵگەی کوردیش یەکێکە لەو کۆمەڵگا بەهێزانەی، کە خێزانی لەوپەڕی ڕەوشتبەرزیدایە...

لەگەڵ بەرەوپێشچونو بەرفراوانبوونی پەیوەندییەکانو تەکنەلۆژیا، ئەم پرۆسە پیرۆزەش تووشی خەلەلو لادان لە سکەی خۆی بوو، تەنانەت بەرەو دارووخانو پاشەکشەو تێکچون ڕۆیشت، بەهۆی ئەوەی ڕێگای بەستنو گرێدانی ئەو پرۆسە پیرۆزە لێڵو تەمومژاویی بووە، پەیوەندییەکان لەسەر بنەمای سۆزداری ساختەو جووڵانی هەستێکی ئاژەڵییانەو بیرکردنەوە بۆ تێرکردنی ئەوە غەریزەیە، زۆرجار بووەتە سەرچاوەی گرێدانو ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە، دوورکەوتنەوە لە دینو دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکانو ڕەوشتەکانی کۆمەڵگە لێرەوە چەکەرە دەکات...

کەواتە: بۆئەوەی هاوسەرگیرییەکی هەمیشە زیندوو بنیات بنێینو ئەو کۆشکە دووبارە لەسەر شارێی خۆیو لە جێگەی ئامانجو مەبەستی خۆی بنیات بنێینەوە، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ هەنگاوی یەکەمی بنیاتنانو بناغەکەی؛ بۆئەوەی بەپتەویی بمێنێتەوەو تووشی دارمانو لێکترازان نەبێتو لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگار، زیندووبوونەوەو خۆشەویستیو فیداکاری بەرهەم بهێنێت...

ئەویش بە ڕەچاوکردنی ئامۆژگارییەکانی ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای مرۆڤایەتی، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)، کە دەفەرموێت: (ئافرەت لە بەر چوار شت مارە دەکرێتو دەهێنرێ: لەبەر ماڵو سامانەکەی، یان لەبەر ڕەچەڵەکو ناودارییەکەی، یان لەبەر دینو ڕەوشتی ئافرەتەکە، یان لەبەر جوانیو شۆخو شەنگی ئافرەتەکە، ئەو ژنە بێنە کە خاوەن دینو ڕەوشتە، دەکەویتە ناو خێرو خۆشییەوە)!

بەسەرنجدانی ئەم فەرموودەیە بۆمان ڕووندەبێتەوە بۆ هاوسەرگیری دینو ڕەوشتی هەڵبژاردوە، لەبەرئەوەی کاریگەرترین مەرجە بۆ هاوشانی ئەو پیاوەی پابەندی فەرمانەکانی ئیسلام دەبیو شتێك کە قەدەغە کرابێ خۆی لێ دوور دەخاتەوە، ئەوا ئەو پیاوە هەڵسوکەوتو مامەڵەو ڕەفتاری بەرامبەر خێزانەکەی چاکو باش دەبێتو ڕێزی دەگرێتو خۆشی دەوێتو دەبێتە پارێزگاری خێزانەکەی لە هەموو بوارەکاندا، ئافرەتێکیش خاوەن دینو ڕەوشت بێت، ئارەزووی نەفس کاری تێناکاتو چەواشەی ناکاتو خۆیشی بەرامبەر بە نەفس بەسوك دانانیو کاروباری ناوماڵ فەرامۆش ناکاتو لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیداو لە مافەکانی مێردەکەی بێ ئاگا نابێت..

ئەوە ڕێگای یەکەمو کۆتایی کامەرانیو خۆشگوزەرانییە، بۆ بەردەوام هێشتنەوەو هێز بەخشین بەو پرۆسە پیرۆزە، بەدەر لەوە دەبینین ڕێگاکانی تر ناتوانن بەردەوام بن؛ چونکە هەر ئەوەی کە غەریزە نەگریسەکانیان بەرەو پوکانەوەو تێربوون ڕۆیشت، ئیتر هیچ پەیوەستییەكو پەیوەندییەکی ڕۆحیو خۆشەویستییەکی تر نییە بە یەکیانەوە ببەستێتەوەو ئەو پردی پەیوەندییە دەڕووخێنن، کە لەسەر پایەیەکی ناو خاڵیو پوچ درووست ببوو...

بۆئەوەی هاوسەرگیرییەکی هەمیشە زیندوو بەرجەستە بکەین، پێویستە لە عەقڵییەتی ماددیو جەستەیی بچینە دەرەوەو دینو ڕۆحو ڕێزو سۆزو خۆشەویستی بە ئامانج بگرین، خستنەوەی وەچەیەکی خوداپەرستو ئازادو ئاشتیخوازو یارمەتیدەرو خزمەتگوزار بۆ خەڵكو نیشتیمان لە دیدماندا بێت، دەبێت خزمایەتیو دۆستایەتیو بەزەییو ڕۆحێکی زیندوو فیداکارو فراوانو هۆشیار، ناخێکی جوانو پڕاوپڕ لە بۆنی گوڵاوو شەهامەتی بەرز، ئامانجمان بێت، نەك تەنها جوانی جەستە، کە بە تێپەڕبوونی کات بەرەو سیسبوون دەچێت، نەك هەر پارەش کە ئەویش، تا سەر هی کەس نییە، هەموو کەسیش، تا سەر لێی بێبەش نییە، وەك دکتۆر ئەحمەدی خانی دەڵێت:

ژن مارە بڕین، نەك بە پارە کڕین.

زۆر گرنگە وردبینو دووربینو ناخی پاك، بکەینە سەرچاوەی بڕیاری ژیرانە..

وەك خۆشەویستمان سەروەری مرۆڤایەتی فەرمویەتی: (بێگومان زۆرترین هاوسەرگیری، کە بەرەکەتو بەختەوەری تێدابێت، ئەو هاوسەرگیرییەیە، کە مارەیی کەمە)، لە کۆتاییدا هیوادارین هەوڵ بدەین لە پێناو بنیاتناوەو ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای بەردەوامیو کامەرانی خوشكو برایانمان لە ئەنجامدانی ئەو پرۆسە پیرۆزەدا.



# چاوەکان هەموو کات ڕاستی نابینن!

بێگەرد فارس

شــەوێك لە شــەوان دڵی ســوڵتان توند دەبێتو نائارامییەك تەنگی پێهەڵدەچنێ، بێئەوەی هۆکارەکەی بزانێت، بانگی سەرۆکی پاســەوانەکانی دەکاتو پێــی دەڵێت: با کەمێــك بچینە دەرەوە؛ بۆئەوەی بزانین لەناو شــار چی دەگوزەرێ؟ سرووشــتی سوڵتان وابوو هەندێجار خۆی دەگۆڕیو بە نێو کوچەو کۆڵانەکانی شاردا دەگــەڕا؛ بۆئــەوەی ئــاگاداری بارودۆخی خەڵکەکــەی بێت، ئەو شــەوەش هەر بۆ ئەو مەبەســتە چوونە دەرەوە، هەتا گەیشــتنە دەوروبــەری شــار، پیاوێکــی بەدیکــرد، کــە لەســەر زەوییەکە کەوتووە، ئەویش خێرا خۆی گەیاندێو ویســتی هەڵیســێنێتەوە، بینی جەســتەی ســاردبووەتەوەو چاوەکانی بۆ هەمیشە لێکناوەو ماڵاوایی لە ژیان کردووە، بەڵام ئەوەی بەلای ســوڵتانەوە جێگەی سەرسوڕمان بوو، ئەوەبوو کە خەڵکی بەلایدا تێ ئەپەڕیو گوێیان پــێ نەدەداو بەجێیان دەهێشــت، ســوڵتان بانگیکردنو پێی وتن وەرن، بۆچی کەســێك ئەو پیــاوە مــردووە هەڵناگرێتەوە؟ ئەو کێیەو کەسو کاری کێن؟

ئەوانیش وتیان: جەنابی ســوڵتان ئەوە فلاَن کەســی بێدینو زیناکــەرو مەیخۆرە، ســوڵتان وتی: ئایا لــە ئوممەتی پێغەمبەر محەمەد(ﷺ) نییە؟ وەرن لەگەڵمدا هەلگرن؛ بۆئەوەی بیبەینەوە بــۆ لای خێزانەکــەی، خەڵکەکە ناچار لەگەڵ جەنابی ســوڵتاندا تەرمەکەیــان هەلگرتــەوەو بردیانــەوە بــۆ لای خانەوادەکــەی، تەرمەکەیــان داناو بەجێیان هێشــت، تەنها ســوڵتانو ســەرۆکی پاسەوانەکان لەوێ مانەوە.

کاتێــك خێزانەکەی بینی دەســتی کرد بە گریانو شــیوەن، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: «ڕەحمەتی خودات لێبێت، گەواهی دەدەم کە تۆ لە پیاوباشــان بوویت»! ســوڵتان سەری ســوڕما بە وتەی ژنەکەو لێی پرسی: چۆن پێی دەڵێیت پیاوباش لە کاتێکدا خەڵکی تەنانەت بە مردوویش گوێیان پێ نەدەداو بە زیناکەرو مەیخۆر باســیان دەکرد؟! ژنەکە وتی: دەمزانی ئەوە ڕوو دەداتو خەڵکی وای دەناســن، بەڵام هاوســەرەکەی من هەموو شــەوێك دەچووە مەیخانەکانو هێندەی لە توانایدا هەبووایە، خواردنەوەی دەکڕیو دەیهێنایــەوە ماڵەوە دەیڕشــتو دەیگوت: بەم کارەم باری شــانی موســڵمانان ســووك دەکەم، هەروەها دەچوو بۆ ئەو شوێنەی کە کاری خــراپو بەدڕەوشــتی تێدا دەکرا، پــارەی دەدا بە خاوەنی شــوێنەکە؛ بۆئەوەی هەتــا بەیانی گەنجان بۆیــان نەبێت بچنە ژوورەوە، بەومەبەســتەی لاوانــی شــارەکەی لە تووشــبوون بەو کارە بپارێزێت. ئەو زۆر دڵخۆشو ئاســوودە بوو بەو کارەی، زۆر سوپاسی خودای دەکرد بەوەی پێی هەڵدەساو بە کارێکی پیرۆزی دەزانی، خەڵکیش وایان دەبینی بۆ خواردنەوەو ڕابواردن سەردانی ئەو شوێنانە دەکات، بۆیە وای پێ دەڵێن، ڕۆژێك پێم وت: ئەگەر بمری کەس نوێژیشت لەسەر ناکاتو کەسێك نادۆزیتەوە بتشوات دوای مردنتو وەك موسڵمانێك بتنێژێت، پێکەنیو وتی: مەترسە سوڵتانو زانایانو وەلییەکان نوێژم لەسەر دەکەن، سوڵتان دەستی کــرد بە گریانو وتی: ئەو ڕاســتی گوتووە، من ســوڵتانم بەیانی دەیشۆینو نوێژی لەسەر دەکەینو بەڕێزەوە بە خاکی دەسپێرین!

لەم چیرۆکەوە ئەوە فێردەبین مەرج نییە ئەوەی دەیبینینو دەیبیستین ڕاست بێت؛ چونکە توانای بینینو پەی بردنمان نییە بــەوەی دەگوزەرێ، ئەگەر نهێنیو نیازی دڵەکانمان بزانیایە، ئەوا بێگومان زمانمان گۆی نەدەکرد.



گوڵان حەمەئەمین



# پرسیارەکانی منداڵەکەت فەرامۆش مەکە!

وەك هەموو غەریزەکانی تر سێکسیش یەکێکە لە ئارەزووەکان، خودای گەورە لە ناخی مرۆڤەکاندا درووستی کردووە بۆ بەردەوامی ژیانو چێژ وەرگرتن، هەندێك لە پسپۆڕان لایان وایە منداڵ لە تەمەنی سێ ساڵییەوە، یاخود دووساڵییەوە ئەم غەریزەیەی گەشە دەکات، منداڵ بە سرووشتی خۆی حەز بە فزوڵیو شارەزابوون لە چواردەور دەکات، حەز دەکات پرسیار لە بارەی زۆرێك لە شتەکانی دەوروبەر بکات، ئەمەش شتێکی سرووشتییە ئەگەر پەروەرشیار بە وریاییەوە مامەڵە بکات. بۆ نموونە کچ دەپرسێت بۆ ئەو وەك کوڕ نییە، یاخود کوڕ دەپرسێت بۆ خوشکەکەی، یان منداڵی فلان وەك ئەو نییە، بەڕاشکاوی پێی بڵێ ئەو کوڕە، یاخود ئەو کچە، بێ پێچو پەنا، هەندێ کات منداڵ یاری بەو ئەندامانەی خۆی دەکات، گەورەکان پێی شەرمەزار دەبنو تووڕە دەبن، دەڵێن عەیبەو سەرزەنشتی منداڵ دەکەن، لە کاتێکدا منداڵ نازانێت بۆ عەیبە، باشتر وایە سەرقاڵی بکەی بەشتی ترەوەو لە بیری بەریتەوە. منداڵ لە تەمەنی پێش هەشت ساڵی، یاخود هەندێ منداڵ پێش دەساڵی پێویست ناکات زانیاری لەسەر ئەم بوارە پێ بدرێت، مەگەر شتانێکی سادە وەك باسمانکرد، پێگەیشتنی منداڵ جیاوازە لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر. ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانە گرنگە لە بەرامبەر منداڵدا بۆ بە دووربوون لە کێشەی لایەنی جنسی.

١- مامەڵەکردنی دایكو باوك، یاخود گەورەکان زۆر گرنگە.

٢- نابێ گەورەکان هیچ جۆرە قسەیەك بکەن لەوبارەوە لە پێش چاوی منداڵ.

٣- بەکارهێنانی پۆشاکی گونجاوو دەرنەکەوتنی شوێنەکانی لاشە با لە نێو ماڵیشدا بێت.

٤- ماچ نەکردنو باوەش پیانەکردن بەشێوەی نەشیاو لەپێش چاوی منداڵ.

٥- نەچونە ژوری نووستن پێش خەوی منداڵ، هەستان لەخەو پێش منداڵ.

٦- مەهێڵە منداڵ کە لە خەو بە ئاگابوو لە نێو جێگەدا زۆر بمێنێتەوە، یاخود بەریەك کەوتن ڕوو بدات.

٧- جیاکردنەوەی ژووری نووستنی منداڵ، نەخەواندنی منداڵ لە ژێر یەك بەتانیدا.

٨- سەیرنەکردنی ئەو فلیمو کلیپو ئەفلام کارتۆنانەی کە وروژێنەری سێکسە.

٩- ئاگاداری هاوڕێکانی بە؛ چونکە ڕەنگە منداڵێکی هاوڕێی باسی ئەو بابەتەی لابکاتو کاریگەری لەسەر درووست بکات.

١٠- ئاگاداربوون لەو یاریانەی پلەیستەیشن کە هەندێکیان زۆر نەشیاوە.

کاتێك منداڵەکەت تەمەنی دەگاتە هەرزەکاری (مراهقی) تەمەنی هەرزەکاری تەمەنێکی ترسناکە سەبارەت بەجنس، ئەگەر بێتو هۆشیار نەبیت، لەم تەمەنەدا گەشەیەکی زۆر دەکات لەم بوارەدا، بۆیە دەبێت تەواو وریا بیت بەتایبەت دایكو باوك، پێویستە زۆر بەڕێزو شکۆوە مامەڵە بکەن، تەواو وریا بن لە کاتێکدا کە منداڵ لە ئێستادا زۆر کاتەکانی بە تەلەفزیۆنو ئینتەرنێتەوە بەسەر دەبەنو پەی بە زۆر نهێنی دەبەن کە گەورەکان نایزانن، پێویستە دایكو باوکیش ئاستی هۆشیاریو زانیاری خۆیان بەرز بکەنەوە، ئەو بەرنامانە دابەزێنن لە کۆمپیوتەرو ئایپادو مۆبایلەکاندا کە ڕێ لە دابەزاندنی بابەتە سێکسییەکان دەگرێت، منداڵەکانیان سەرقاڵ بکەن بە ئەنجامدانی وەرزش لە یانە گونجاوەکاندا، یاخود لە نێو ماڵدا، گەشتو سەیران ڕێك بخەن لە پێناو منداڵەکانیان، هەوڵ بدەن کاتێکی باشیان پێ ببەخشن بە هاوڕێیەتیکردن لە هەمو ڕوویەکەوە، گێڕانەوەی قسەی خۆشو پێکەنین تا زۆربەی کاتەکانیان لە نێو خێزاندا بن، کاتێکی دیاریکراو بۆ خوێندنو کاتێکی دیاریکراو بۆ خەوتن، هەروەها هەوڵ بدە وەڵامی پرسیارەکانی بدەرەوە ئەگەر لەبارەی جنسیشەوە بێت، ڕێنمایی پێویستی بدەرێ سەبارەت بەگەشەی خودی خۆی، لە ڕووی لاشەییەوە لەو تەمەنەدا...



# پەشیمانم

و: بشرى ابوبكر

دكتۆر فەرهەنگ پسپۆر لە دەروونناسیو پەروەردەكردنی منداڵدا لەبارەی كەمو كورتییەكانی لە پەروەردەی منداڵەكەیدا بەم جۆرە پەشیمانی دەردەبڕێت:

گەر بڕیار بووایە جارێكی تر منداڵەكەمم گەورە بكردایەتەوە ئەوا:

* كەمتر پەنجەی هەڕەشەم بەرەو ڕووی بەرز دەكردەوە.. لەبری ئەوە زۆرتر ئامۆژگاریم دەكرد.

* كەمتر بیرم لە تەمێكردنی دەكردەوەو زیاتر گرنگیم بە پتەوكردنی نێوانمان دەدا.

* كەمتر تەماشای كاتژمێرەكەمم دەكرد، چاوەكانم زیاتر لە تەماشاكردنی ئەودا بەكاردەهێنا.

* كەمتر لەگەڵ هاوڕێكانمدا دەچوومە گەشتو سەیران، زیاتر لەگەڵ منداڵەكەمدا دەچوم بۆ گەشتو سەیران، میزەڵدانی زیاترم لە گەڵیدا هەڵدەدا بۆ ئاسمان..

* كەمتر خۆم جدی دەكردو جدییانە تر لەگەڵ ئەودا یاریم دەكرد.

* ڕێگای زیاترم لەگەڵ ئەودا تەی دەكردو زۆرترین هەنگاوم لەگەڵدا دەنا، پێكەوە تەماشای ئەستێرەی زیاترمان دەكرد.

* كەمتر ڕامدەكێشا، تا خێراتر ڕێ بكات، بەڵكو بە هێواشیو بە پێی هەنگاوەكانی ئەو، هەنگاوم لەگەڵدا دەنا.

* كەمتر ڕەفتاری توندو وشكم بەكاردەهێناو لە جێگەی ئەوە زیاتر پشتگیریم لێدەكرد.

* لەجێگەی بیركردنەوە لە دروستكردنی خانوەكەم، متمانەبە خۆبوونم لە ئەودا دروستدەكرد.

* لە جێی ئەوەی ئەوینی دەسەڵاتم لە خۆمدا گەورە بكردایە، دەسەڵاتی ئەوین پێدانم لە خۆمدا دروستدەكرد.

خۆشەویستان.. ئەگەر (دكتۆر فەرهەنگی پسپۆر) ئەم هەلەی لە دەستچووەو ناتوانێت جارێكی دیكە ئەم هەنگاوانە لەگەڵ منداڵەكەیدا پیادە بكات، ئەوا ڕەنگە زۆریك لە ئێمە ئەو هەلەی لەدەست نەچووبێت، هێشتا دەتوانین بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ منداڵەكانمان بكەین، كە بەڕێز فەرهەنگی پسپۆر ئاواتی بۆ دەخوازێت!!



# خۆت بەم شێوەیە بینیوە؟

شۆخان عەلی ئەحمەد

بیرت دێت کاتێك منداڵ بوویت، دەستێك هەبوو هەمیشە دەستی دەگرتیت، چاوانێك هەبوون هەمیشە بە دواتدا دەگەڕان، دڵێك هەبوو هەمیشە ئاگای لێت بوو، هەستێك هەبوو هەمیشە دەیویستو دەگەڕا، تاوەکو بزانێت تۆ هەست بەچی دەکەیت، یان چیت دەوێت؟ چی سەرنجی ڕاکێشاویت؟ نەوەك برسی بیت؟ نەوەك تینوو بیت؟ نەوەك سەرماو گەرماو نەوەك هەرشتێکی تر، کە تۆ لێی بێدەسەڵاتبوویتو نەتدەتوانی دەریانببڕیت، یاخود ئەنجامیان بدەیت...

هەمیشە باوەشێك هەبوو لە کاتی ترسدا وەکو پۆڵا دەیپاراستیت... ئەو خێزانەی کە تۆیان پەروەردەکردو وایان لێکردیت بتوانیت لەسەر پێی خۆت ڕابووەستی، ئەو خێزانەی کە تۆ ئێستا ئەندامێکیت لە ئەوان، ئەوان کە تۆیان کرد بەو مرۆڤەی کە ئێستا هەیت، گرنگ ئەوە نییە، کە ئەو خێزانە کێیە؟ گرنگ ئەوەیە کە تۆی پێگەیاندووە، تاوەکو بەرەو دنیایەکی نوێ هەنگاو بنێیت، تاوەکو شەڕ لە پێناو سەرکەوتنت بکەیت... تاوەکو بە بیرکردنەوەکانت دنیا بگۆڕیت، بێگومان تۆ دەتوانیت هەموو ئەمانە ئەنجام بدەیت.

چیتر تۆ منداڵەکەی جاران نیت، چیتر کەست لە چواردەور نییە، ئەوەی منداڵی بوو.. بوو بە یادگاریو ئەو کاتانەی لەگەڵ خوشكو براکانت لەسەر یارییەکی بێ بەها لە یەکتری تووڕەدبوون، دایەو بابەتان بانگ دەکرد بۆ ناوبژی، بەڵام ئێستا کێشەکانتان چیتر هێندە بچووك نییە، ئێستا... خۆتان بە باشتر دەزانن بۆ چارەسەر، بگرە ئێوەش چارەی کێشەکانی ئەوان دەکەن. هەندێك جاریش لێیان بێزار دەبن، ڕەنگە بشڵێن: من خۆم هەزارو یەك کێشەم هەیە، ئۆف دایە! ئۆف بابە!

ئای چ ئازارێکتان بۆ ئەوە کێشا، تاوەکو ڕۆڵەکانتان پێبگەیەنن، ئەوەش ڕۆڵەکانتان، کە تەنانەت هەندێك جاریش شەرم دەکەن لەوەی کە دایكو باوکیان بناسێنن! شەرم دەکەن لەوەی باسی نەبوونی منداڵیان بکەن، لە ڕوویان نایەت ئاوڕێك بۆ دواوە بدەنەوەو باسی ماندوویێتی دایكو ڕەنجو شەکەتی باوکیان بکەنو شانازی بەو دەستانەوە بکەن، کە لە ماندوێتیدا ڕەنگی ڕزیویان لێنیشتووە. یان وەك بێئاگایەك ڕەفتار دەکەن. لەجێی شانازیکردنو خزمەتکردن بەو دەستانەو سارێژکردنی زامەکانیو بەرزکردنەوەی دەستەکانیو بیخاتە سەر ئەو ڕوخسارەی کە چەندین ساڵە، تامەزرۆی بینینی بووە، لەگەڵ ئەوەش ڕەنگە پێت بڵێت خۆزگە هەر منداڵەکەی جاران دەبوویت، بەس نییە ئەو کات هیچ نەبێت بۆ پێویستیەکانت ڕووت لە من دەکرد، دڵنیابووم هاوارکردنەکانت هەموو داواکاریبوون، بەهۆی بێدەسەڵاتیتەوە، بەڵام ئێستا هاواردەکەیت وەك بڵێیت تاوانبارێکت لە ژێر دەستە. چۆن دڵت دێت؟ چۆن دەتوانیت هێندە بێباك بیت بەرامبەر بەو میهرەبانییەی کە تەنها بە بۆنکردنی خەو دەیبردیتەوە. دە هەستە! ئێستا چاوەڕوانی تۆن، تاوەکو پشویەك بە ئەرکەکانت بدەیتو هەواڵێکی دڵی ناسۆریان بپرسیتو لە تەنیشتیانەوە دابنیشیت؛ بۆئەوەی هەستی ماندوێتی چەندساڵەیان بڕەوێنیتەوە، بە تەماشاکردنێکی ڕوخساریان. ئەم خێزانە بە بوونی تۆ تەواو دەبێت، تۆش وابکە سوپاسگوزاربن بەبوونت، دڵخۆشبن بە بیستنی دەنگت، ئەمانەش هیچ باشییەك نین لە تۆوە بۆ ئەوان، ئەگەر بەدرێژایی تەمەنت خزمەتکاریان بیت، ناتوانی پاداشتی تەنها یەك شەونخونی ئەوان بدەیتەوە، پاشان تۆ بەبێ خێزان ناتوانیت بوونت هەبێت لەم دنیایە، بەڵام خێزان بەبێ تۆش هەر دەبێت، ژیانیش بەردەوام دەبێت، بەڵام تۆ (هەوڵ بدە ژیانت بە باشییەکان جوانتر بکەیت، نەوەك لە چاوەڕوانی ژیانێکی جوانتردا بمێنیتەوە).

گوتم: گەردنکەچی عیشقت منم تەنها، گوتی: شێتی سەدی وەك تۆ، لە هەر سوو، بەستەیی زنجیری گێسوومە
گوتم: با بەس لە خوانی وەسڵی تۆ، نەومێدو بێبەش بم
وتی: مردووت مرێ عاشق، بەدایم زارو مەحروومە - سالم -



# ئازاری ڕێ!

گەرمیانی

هەنگاونان بە ڕێگەی ئەویندا، هێند گەورەیە، کە ئەویندارا پێش پێ، سەریان دەخەنە سەر ئەو ڕێیە! ئیدی ڕێگایەك، کە هەنگاوی یەکەمی بە سەر بێ، ڕێبوار بیر لە هیچ ئازارو نارەحەتییەك ناکاتەوە!

لە ڕێی ئەو شۆخەدا، خۆم کردە خاکو پێی نەنا پێما
دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم، چی بکەم؟ - مەحوی -

ئەویندار، خەم لە بوون بە خاك ناخوا، بەڵکو خەمی ئەوەیەتی: نەبوە بەو خاکەی شایانی ژێرپێی یارەکەی بێ!

ئەوە مونتەهای ئەمەلی ئەویندارە!

ئەو کاتەی یار دێتە دیوانی دڵیو ئاورێکی لێ دەداتەوە! دەستی دەگاتە دامێنیو چاوی بە سورمەی تۆزی پێیەکانی دەڕێژێ، ئەو کاتەی دەگاتە دیدارو بە سۆمای چاوەکانی بۆ تۆزی دیدەی دەڕوانێ!

ئیدی داوایەکی نامێنیو مەتڵەبێکی دی ناخوازێ!

کە تۆ دێیت، ئیدی من تەنیاییم دەڕەوێتەوە، کە تۆ دێیت، ئیدی من بێکەس نیم، ئیدی دەتوانم بدوێم، پێبکەنمو هەست بە وجوودی خۆم بکەم!

ئیدی دڵم سوکنایی دێتو لە باوەشی نەرمی وشەکانتا، ئۆقرە دەگرێ!

ئەگەرچی داخی تۆی، پێ بەرمە تۆی گڵ
ئەزانم، هەر لەوێشدا، تۆی ئەوێ دڵ
حەکیمو دوکتۆرو دەرمان، دڕۆیە
بە تەنیا گوڵ دەزانێ، دەردی بولبول - کەمەندی -

هاتنەوەی تۆ، هاتنەوەی ڕۆحو گەڕانەوەی بەهەشتی منە، نازانم بێ هەناسەی تۆ، ئەی یار، من درێژە بە چی دەدەم؟! ئەگەر چاوەڕوانی تۆ نەبا، من بۆچی دەژیامو چیم دەکرد؟!

لەوساوە کە تۆ ڕۆیی، دڵم ڕۆیی بە دووتا
هێلانەیی تەن، هەروەکو مەئوای سەقەرما -حەریق -

کە تۆ دەڕۆی، ئیدی بۆنی هەناسەت، ئەم دەڤەرە چۆڵ دەکاو چریکەی ئاوازی دەنگت، ئەم شارە دەکا بە وێرانە!

بێ ترووسکەی چاوەکانت، ژیانم وەك پەڕاوێکی دڕاو، پەرتو بڵاوەو دڵم وەك شووشەیەکە شکاو، سیمام وەك دواساتەکانی ماڵاواییو دواهەناسەکانی مەرگ زەردو ژاکاو...

کە تۆ دەڕۆی، لەم نیشتمانەی مندا، چی دەمێنێ..

نیشتمانی دڵم بێ ئیمپراتۆرو شار بێ شازادەو بەهار بێ گوڵو بێ میسکی هەناسەی تۆیە!

دڵم نایێ کە جێت بێڵم، بڕۆم بێ تۆ بە ڕێگادا
سەری خۆم هەلگرم وەك شێت، بە کێوو دەشتو سەحرادا - کوردی -

شاگرد بێ مامۆستای عومری، دەروێش بێ شێخی تەریقەتو غوڵام بێ شای ڕۆحی، چۆن دەتوانێ بژی!

شەوانە، لە دیوەخانی کام شیعری نوێتا، جەزبە بمگرێو لە باوەشی کام لایلایەتا، وەنەوز بدەم!

لەبەر تیشکی کام مانگەشەو، لەم دەیجوورەدا ڕێگا دەرکەمو بێ مانگی ڕوخسارت بەرەو کوێ بڕۆم؟!

دوێ شەو، کە بەناز لێم چوویتە سەربان
بەو نیوەشەوە، سەرمەت لێشێوان
ئاخر نەمدیبوو هەتاکو دوێ شەو
دوو مانگ بسرەوێ لە یەك ئاسمان — کەمەندی -

هەرگیز ناتوانم دەسبەرداری مێژوو بم، هەرگیز ناتوانم دەست لە یاداشتنامەی عومرم هەڵبگرم، هەرگیز ناتوانم پەڕاوی یادگارییەکانم بسڕمەوە!

خەیاڵم بوو، لە خەیاڵ چێ خەتوخاڵ
هەرچی ڕووی دا، لەبیری کەم وەك خەیاڵ
بەڵام «هیهات» گوڵی شیرینم «هیهات»
چی دەتوانێ مەیلی تۆم لە دڵ دەرکات؟

ئێستا دەزانی بۆچی هەمیشە داوێنم دەگرتیو دەپاڕامەوە...

توخوا بەجێم مەهێڵە، با چیدی تەنیا نەبم، با چیدی شەوانە تاسەحەر، بۆ دووریت فرمێسك نەڕێژم...

تۆ نەتدەزانی من بۆچی ئەوەندە وابەستەت ببوم، بۆچی کە باسی ڕۆیشتنت دەکرد، ئۆقرەم لێ هەڵدەگیرا؟!

مرۆڤێك، هەموو تەمەنی خەونێکی هەبووبێ، دەبێ چی بکات؛ بۆئەوەی ئەو خەونەی لێ نەستێنن؟!

هەموو ئاواتو خۆزگەکانی لە کەسێکدا دۆزیبێتەوە، دەبێ چی بکات؛ بۆئەوەی چیدی لێی دوور نەکەوێتەوە؟!

چاوەکەم، گەواهیم بۆ دەدەن دوو چاوەکەم
من بە یادی تۆوە ئاوا، ڕۆژی خۆم ئاوا دەکەم

من ئامادەم، بۆ پارێزگاری لە وجوودم، بۆ پاراستنی ڕۆحو نیشتیمانی دڵم، هەموو قوربانییەك بدەم، من دەزانم ڕێگای ئەوین سەختەو سوکنای جیواری تۆ، وەها سانا نییە!

هیچ سەودایەکی قبووڵ نییەو هیچ مەرجێ پەسەند ناکا!

بە خوێناوی دڵی زارم، وەرە کاکۆڵ حەنایی کە
مەڵێ: ڕاوەستە تا قوربان، لە عیدەینا بە قوربانم - حەریق -

من لەو ڕۆژەوە گەیشتمە حزوورت، دەمزانی دەبێ پەروانەی باڵسووتاوی شەمعی ڕوخساری نوورینت بم.. بەڵام پەشیمان نیم، دەزانم جگە لە تۆ، دەرمانێك نییە بۆ دەردی من!

دڵ نەخۆشی دەردی هیجرە، جانی جانانم وەرە
لەتلەتە جەرگو هەناوم، ماهی تابانم وەرە
عیللەتی دەردو شەفاکەم، وا بە لێوی شەکەرت
مایەی ژینو حەیاتم، دەردو دەرمانم وەرە - تاهیر بەگ -



# نامە نوورییەکان

ع. ش. شێرکۆ

که باس دێته سەر ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ المائدة: ٥٤

ئیدی ڕۆح دەهەژێو دڵ دەکەوێته ژێر پرووشەی ئارەقی شەرمەزاریو فرمێسك له چاواندا قەتیس دەبێو تەزووی هەست کردن بەگەورەیی ئەوینی خودایی سەراپای لاشەی ئەویندارانی دادەگرێ!

خوداوەند خۆشەویستیی خۆی پێش دەخات "خودای گەورە ئەوانی خۆش دەوێو ئەوانیش خودای گەورەی خۆیانیان خۆش دەوێ!

چونکه گرنگ نییه تۆ خودات خۆش بوێ، ئەوەی گرنگه ئەوەیه؛ خودا تۆی خۆش بوێ!

ئای لەو کەسەی خودا خۆی دەفەرموێ: خۆشم دەوێ!

ئازیزم، قورئانی پیرۆزو فەرمووده شیرینەکان، لێوانلێون له باسی ئەو شتانەی که خودا پێی خۆشەو ئەنجامدەرانی خۆش دەوێت، لەوێدا ڕێگا بەرەو گەیشتن به ئەوینی خودایی بەڕوونی دیاری کراوە!

﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرة: ٢٢٢

﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾ آل عمران: ١٤٦

﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ آل عمران: ١٣٤

ئیبنولقەیم دەفەرموێ: "ئەگەر مەقامی "محبة" نەمێنێ، ئەوا هەموو مەقاماتی ئیمانو ئیحسانیش نامێنێ، مەنزلگاکانی

چوون بەرەو خودا لە نێو دەچن، خۆشەویستیی خودا ڕۆحی هەموو کاروکردارو پلەوپایەیەکە، بەڵکو ئەو خودی ئیخلاسو خودی ئیسلام خۆیەتی؛ چونکە ئیسلام تەسلیمبوونە بە خودا بە تەواوی خۆشەویستیو تەواوی ملکەچییەوە!...

مەحەببەتی ئیلاهی حەقیقەتی عبودیەتە بۆ خودا، ئایا دەکرێ ڕازیبوون بە خوداو سوپاسو سەناکردنیو خەوفو خەشییەو تکاو ڕەجای خودا، بێ خوشەویستی؟!

ئایا ئارامگرتن، ئەگەر خۆشەویستی لەگەڵ نەبێ، چۆن دەبێ؟! بەڵکو سەبرو ئارامیی ڕاستەقینە، تەنها هی خۆشەویستانی خودایە، ئەوان پشتیان بە مەحبووبی خۆیان بەستووە بۆ گەیشتن بە هەموو ئاواتو ئامانجەکانیان!

زوهد لە دونیا نابێ، ئەگەر بەندە لە هەموو خۆشەویستییەک زاهید نەبێ، جگە لە خۆشەویستیی خودا!!

شەرمو شکۆ، وجودی نابێ ئەگەر خۆشەویستی نەبێ، خۆشەویستی وا دەکا؛ دڵ لێوانلێو بێ لە هەیبەتو جەلالو شەرمو شکۆی ئیلاهی!!

گەر خۆشەویستی نەبێ، قرچە لە جەرگەوە نایەو دڵ گڕ ناگرێ بۆ تاسەی دیدار، شەوانە خەو لە چاوان ناتۆرێو لە ئەسحارا فرمێسکی گەرم نارژێ بەسەر لێوی هەڵقرچاوا!!

خۆشەویستی نەبێ، دەستی هەژاریو کەساسیو کزۆڵی، بڵند ناکرێ بۆ ئاسمان!

خۆشەویستی نەبا، پێغەمبەری نازدار، نەیدەگوت:

(وأسألُكَ لذّةَ النظرِ إلى وجهِكَ والشوْقَ إلى لقاءِكَ).

**چونکە خۆشەویست دەزانێ، هیچ لەزەتێک لە تەماشاکردنی ڕوخساری یارو هیچ تاسەیەک لە تاسەی دیدار خۆشتر نییە!**

**تا** خۆشەویستی نەبێ، بەندە ناتوانێ، ملکەچی فەرمانەکانی خودا بێت، وەلێ ئەو **کاتەی دیوەخانی دڵ، ئاوەدانە بە یادی خوداو چرای خۆشەویستیی خودا، خانەی دڵی ڕووناک کردۆتەوە، بەندە بە سەدای** (لَبّيكَ وَسَعدَيكَ)؛ **بەرەو لای خودا هەنگاو دەنێ.**

ئیبنولقەییم زێتر لە «٥٠» ناوو جۆرو سیفاتی خۆشەویستی باس کردووە، بەڵام گەورەترین پلەی خۆشەویستی «عبودییەتە»؛ کە جگە لە خودا، بۆ کەسی دی ئەنجام نادرێ.

مەقامی خۆشەویستی، هەموو تەکلیفاتی ئیلاهی، دەکاتە تەشریفات، هەموو زەحمەتێک دەکاتە ڕەحمەتو هەموو میحنەتێک دەکاتە مینحەت، ئەوامیرو نەواهیی خودا، دەبنە لەزەتی ڕۆحو ئاواتی دڵ، ئیدی دڵ هەست بە تەنیایی ناکا، دڵێک هۆگری خودا بێ، چی ئاتاجی بە بەندەیە؟!

ئاوێتەبوون بە حوببی ئیلاهی، وا دەکا کە بەندە، لە هەموو دەوروبەر بێئاگا بێو دونیاو باقوبریقی فانی، نەتوانن سەرنجی ڕابکێشن!

هەرگیز ڕێگە نادا؛ خۆشەویستی داروبەردو زێڕوزیوی دونیا، موزاحیمی خۆشەویستیی خودا بن!

چما کەسێك، تامی لەزەتی ئەوینی خودایی کردبێ، ئیدی جگە لە وەصڵی ئیلاهی، هیچ مەتڵەبێکی دی دەمێنێ؟!

چونکە ئەوەی گەیشتبێ بە خودا، ئیدی شتێك نامێنێ چاوەڕوانی بکات..

**هەر بۆیە گوتراوە:** (مَن وَجَدَ اللهَ فماذا فَقَدَ ومَن فَقَدَ اللهَ فماذا وَجَدَ).

**داود پێغەمبەریش (سڵاوی خودای لێ بێت) لە نزاکانیدا دەپاڕایەوەو دەیگوت:**

«اللّهُمّ إنّي أسألُكَ حُبّكَ وَحُبّ مَنْ يُحِبُّكَ، وَالْعَمَلَ الّذِي يُبَلِّغُنِي حُبّكَ ، اللّهُمّ اجْعَلْ حُبّكَ أحَبّ إلَيّ مِنْ نَفْسِي وَأَهْلِي وَمِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ».

واتە: خودایە؛ خۆشەویستیی خۆتو ئەو کەسانەم پێ ببەخشە، کە تۆیان خۆش دەوێ.. خۆشەویستیی ئەو کارەم بخەرە نێو دڵ، کە دەمگەیەنێ بە خۆشەویستیی تۆ.. خودایە؛ خۆشەویستیی تۆم لا خۆشەویستتر بێ لە نەفسوماڵی خۆمو خۆشەویستتر بێ لە ئاوی سارد.

ئیمامی هەرەوی دەڵێت: «مەحەببەت نیشانەی ڕێبوارانی تەریقەتی ئیلاهیو پێناسەی بەندەو خودایە؛ چونکە خودا، خوداوەندەو بەندەش، بەندەی ملکەچو خۆشەویستیش لەو نێوانەدایەو ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان خوداو بەندەیە!

پاشان سەبارەت بە پلەوپایەکانی ئەم خۆشەویستییە دەڵێت:

پلەی یەکەم: ئەو مەحەببەتەیە، کە هیچ خەیاڵو وەسوەسەیەك لە دڵدا ناهێڵێو خزمەتکردنی مەحبووب، دەبێتە لەزەتی ڕۆحیو هەموو بەڵاو موسیبەتێکی لا سووکو سانا دەکات.

پلەی دووەم: بەشێوەیەکە، کە خۆشەویستیی خودا، لە سەرووی هەموو خۆشەویستییەکەوەیە!

زمان هەمیشە، سەرقاڵی زیکری مەحبووبەو دڵیش پەیوەستی شوێنەواری سیفاتی مەحبووبەو چاویش نیگای لەسەر ئالاءو ئایاتی بێسنووری خوداو گەیشتنە بە مەقاماتی مەحەببەتی ئیلاهی.

پلەی سێیەمیش: خۆشەویستییەکە، کە دڵی خۆشەویستان کەمەندکێش دەکات.. بەشێوەك، کە زمان ناتوانێ، گوزارش لەو خۆشەویستییە بکاتو وەسفی بکات. ئیدی لە دەریای ئەو خۆشەویستییەدا مەحو دەبێتو جگە لە ڕووکردنە زاتی ئیلاهی، ڕووگەیەك نازانێ!

خۆزگە بە ڕێبوارانی ئەم ڕێگایەو سالیکینی ئەم تەریقەتە!

# لەگەڵ هەژاری شاعیردا



دڵم تەنگە وەکوو خونچەی دەمی تۆ
سەرم گێژە لە گێژیی پەرچەمی تۆ
دڵو ماڵو ژیانم دا بە ماچێك
گوتت پێك نایە زۆری من کەمی تۆ
لە چەشنی ئاگرن کولمی گەشی تۆ
لە مار ئەستەمترن پرچی ڕەشی تۆ
بڵێم وەك چی دەچێ، هەر گوڵ دەزانم
لە گوڵ ناسکترە، ناسك لەشی تۆ

هەژار ناوی "عەبدولڕەحمانی شەرەفکەندی"یە، ساڵی ١٩٢١ هاتۆتە دونیاو ساڵی ١٩٩١ کۆچی دوایی کردووە.

هەژار شاعیرێکی شۆڕشگێڕو کوردپەروەر بووەو زۆربەی شیعرەکانی بۆ کوردو کوردستان تەرخان کردووەو وێڕای شیعریش، دەستێکی باڵای هەبووە لە پاراستنو خزمەتکردنو پەرەپێدانی زمانی کوردیداو فەرهەنگی.. (هەنبانە بۆرینەش) گەورەترین گەنجینەیە، کە هەژار بۆ نەتەوەکەی بەجێ هێشتووە.

جا ئەی دەنگخۆشەکەی چەلەنگ    بوێژەکەی بە ناوو دەنگ
لە ناو باڵدارو گوڵاڵە    تەنیا جێگەی تۆ بەتاڵە
گوڵ ئامێزی گرتۆتەوە    خونچە خۆی ڕازاندۆتەوە
جێت لەسەر چڵ چاکراوە    بەڕەی گەڵا داخراوە
داران ئامادەی گوڵباران    لێت پیرۆز دیداری یاران
واتۆ گەیتە کامی دڵت    شاد بە بە دیداری گوڵت
بچریکێنە تا دەتوانی    بخوێنە بە کامەرانی
سروودی جێژنی ئازادی    ڕزگاری لە نامرادی

*    *    *

زمانم لێ داگیر کرا    مێشكو دڵم خورا، برا
خوێنیان مژیم،گۆشتیان خواردم    ئێسکیان بە سەیان ئەسپاردم
لای تورکە نیوەی کەلاکم    عەجەم بەربوونە لوولاکم
عارەبیش بەشی خۆی دەوێ    قاپێك لێرە، قەپێك لەوێ
هەر لە یەك سەعاتو یەك دەم    عەرەبمو تورکیشمو عەجەم
پێم دەڵێن تورکی کێوانی    یان لە قەحتانو شەیتانی
یەك دەڵێ مێژوومان یەکە    ئەگەر بشتخۆم دەنگ مەکە

*    *    *

ئەرێ ئەی کیژە کوردەی چاو کەژاڵە
ئەرێ ئەی شۆخو شەنگی چاردە ساڵە
ئەتۆ خۆت کوردو خوێنی لاوی کوردان
بە تورکی چاوی مەستت کرد حەواڵە
بە خوێنی مەی دەدەی ئاوی مژۆڵت
بڕژانگت بۆچی سەر نێزەی کەماڵە؟
ڕنووی سەر ئاگرین لاجانگو کولمت
لە خوێنی نەوجەوانان شەلاڵە
بڵێی ئێرانو عارەب بێ، دڵی تۆ
کە لێی تەئسیری ناکا ئاەو ناڵە
مەگەر چاڵی چەنەت زیندانی قەسرە؟
کە ڕزگاربوونی ئێمەی لێ مەحاڵە
تەنافی زوڵفت ئاوێزانی باڵات
نەمانی هاونژادانت خەیاڵە
روحت بردم بە قەندی لێوەکانت
دەزانی کورد بە قەند وێرانە ماڵە
قەباڵەی ئاشقیم زۆر موعتەبەر بوو
چ قەوما چاوم ئەمڕۆ پێت بەتاڵە
لە ئاەو ئەشکی بێ چاران حەزەر کە
وە ئەستۆ مەگرە چیدی ئەو وەباڵە
مەگەر ترست نی یە دەستی زەمانە
وەرێت بێنێتەوە ئەم ژینە تاڵە
کوڕی شێرانو ئەفسەح بووم بە دەس تۆ
هەژارێکم زمانم لەنگو لاڵە